# هونەری گفتوگۆکردن



چەند نمونەیەك لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن






أ.سليمان بن عوض قيمان

وەرگێڕانی: تۆفیق کەریم

کتێبی خاڵ - ٢٠ -

له بڵاوكراوەكانی ناوەندی هزریی و ڕۆشنبیریی خاڵ

ژماره (٢٠)

ناوی كتێب: هونەری گفتوگۆكردن

نوسینی: أ.سليمان بن عوض قيمان

وەرگێڕانی: تۆفیق كەریم | مەلا یاسین وەرتی

چاپ: یەكەم - ٢٠١٨

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاین و نەخشەسازی ناوەوە: مەهرین دیزاین



لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان

ژمارەی سپاردنی ( ١٣٧٧ ) ی ساڵی

# هونەری گفتوگۆکردن

## چەند نمونەیەک لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن
## - درودی خوای لەسەر -

نوسینی:

أ.سليمان بن عوض قيمان

وەرگێڕانی

تۆفیق کەریم

مەلا یاسین وەرتی



# سەرەتای وتەکان

**خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ:**

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥ ﴾ النحل: ١٢٥ .[١]

**گفتوگۆ (دیالۆگ) پێویستیەکی مرۆییە و شاڕێگای بەیەکگەیشتن و ڕێزمەندترین ڕێبازی قسەکردنە ..**

**گفتوگۆ باڵاترین شانازی ئادەمیزادە، هەروەها پێشکەوتووترین پرۆگرامی رۆشنبیرکردن و فێرکردنە .**

**گفتوگۆ وەکو نەخش وایە بەناخی دەروونندا رەگ دادەکوتێ و شوێنەواری هەمیشەیی بەسەر رەفتارەوە بەجێدەهێڵێت .**

---

[١] **النحل : ١٢٥. واتە: بانگەواز بکە بۆ ڕێگای پەروەردگارت بە دانایی و ئامۆژگاری جوان ، موجادەلەیان لەگەڵ بکە بە جوانترین شێواز، بێگومان پەروەردگارت خۆی زاناترە بەوەی لەڕێگای ئەو لایداوە و گومڕا بووە هەر خۆیشی زاناترە بەوانەی ڕێنموونی کراون .**

# پێشەکی وەرگێڕ

بەم سەردەمە دەوترێت چەرخی گفتوگۆکان، گفتوگۆی شارستانیەتەکان، ئاینەکان، گەلان، مرۆڤەکان،.... بێ ئاگا لەوەی موحەمەدی پێغەمبەر و سەرکردە - دروودی خوای لەسەر - زۆر لەمێژە ئەو دەستپێشخەرییەی کردووە و لە ڕێگای گفتوگۆوە سەرنجی زۆر کەس و گەل و خاوەن ئاینی دیکەی ڕاکێشاوە و دانیان بە مەزنی و سەروەری خۆی و ڕاستێتی ئاینەکەیدا ناوە. نووسەری ئەم کتێبە بە بەڵگەی ڕاست و دروست ئەم حەقیقەتانەی سەلماندووە، کە بەڕاستی شێوازێکی نوێی خستنەڕووی ژیان و ئاکاری پێغەمبەری مەزنە، دوورکەوتنەوەیە لەو دارشتنە باوەی کە مێژوونووسان لەسەری ڕاهاتوون.

دوای ئەوەی یەکەم کتێبی نووسەرم (هونەری سەرکردایەتیکردن لە ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن) وەرگێڕا بۆ زمانی کوردی و لە لایەن خوێنەرانەوە پێشوازی گەرمی لێکرا و هەرزوو لە کتێبخانەکاندا نەما، بیستم برای بەڕێزم مامۆستا مەلا یاسین وەرتی دەستی بە وەرگێڕانی (هونەری گفتوگۆکردن) کردووە، بەڵام بە هۆی سەرقاڵییەوە جگە لە سی و پێنج لاپەڕەیەکی سەرەتای لەوی دیکەی وەستاوە، منیش مۆڵەتم لێوەرگرت و بەشەکانی دیکەیم وەرگێڕا، دەستخۆشی و سوپاسی زۆرم بۆ جەنابی مامۆستا هەیە کە زۆر بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی نواند بۆ تەواوکردنی پرۆژەکەی، ئومێد دەکەم ئەم وەرگێڕانەی من و مامۆستا یاسین قسەیەکی نوێ بێت لە بواری پێغەمبەرناسییدا، توێشوویەکیش بێ لە خزمەتی سەروەرەکەماندا رووسوورمان بکات.

" تۆفیق کەریم "

## دەسپێك

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، بەدیهێنەرو ڕۆزی دەری تێکڕای دروستکراوان:

﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ۝٦﴾ هود: ٦ .[1]

درود و سلاوی خوا بڕژێ بەسەر پەیامبەری ناو نەخوێندەواران، ڕووناکی چاوی یەکتاپەرستان، کە نێردراوە بۆ لای هەموو خەڵکی بە تێکڕایی و بۆ سەر ماڵ و خێزان و هاوەڵانی و ئەوانەی شوێنیان کەوتوون بە چاکە تاکو ڕۆژی دوایی.

مرۆڤایەتی چاوی هەڵێنا بەسەر گەردووندا بۆ ئەوەی یەکەم شتێك کە دەکەوێتە بەر چاوو گوێچکەی ئەو گفتوگۆیە بێت کە لە ئاسمانەوە لەنێوان پەروەردگاری بەدیهێنەرو مرۆڤدا هاتە ئاراوە، ئەو مرۆڤەی هێشتا گەردیلەیەك بووە لە پشتی ئادەمی باوکی دا ـ سەلامی خوای لەسەر بێت ـ : ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ۝١٧٢ أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ۝١٧٣﴾ الأعراف: ١٧٢ – ١٧٣ .[2]

---

(١) هود: ٦. واتە: هەر گیانلەبەرێ بەسەر زەویدا بڕوات ڕۆزی و ژیواری لەسەر خودایە. خودا بە شوێنی ژیان و مردنیان ئەزانێ. ئەمانە هەموو لە (لوح المحفوظ) دا نوسراون .

(٢) الأعراف : ١٧٢ـ ١٧٣. واتە: ئەی پێغەمبەر ! بیری ئەوە بکەرەوە کە خودای گەورە پێش لەدایکبوونی هەر ئینسانێ لەو کاتەدا کە تۆو بووە لە پشتی باوکیدا ئەو تۆوەی وشیار کردۆتەوە و قسەی لەگەڵ کردووە: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش وتوویانە: بەڵێ پەروەردگاری ئێمەی، کردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان بۆ ئەم پەیمانە نەبادا لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن ئێمە ئاگامان لەم پەیمانە نەبووە . یا بڵێن: باوباپیرانمان هاوبەشیان بۆ خودا داناوە و کافر بوون، ئێمەیش لەبەر ئەوە کە منداڵ و ورد بووین و دوای ئەوان هاتبووین، چاومان لەوان کردو تاوانبار نین. ئایا بەهۆی کاری بەدکارانەوە ئێمە لەناو ئەبەیت و تووشی سزامان ئەکەیت؟

ئەمە گفتوگۆی ئەو سروشتەیە کە بەدیهێنەری داهێنەر لە دەروونی دروستکراوەکانی لە نەوەی ئادەم دا دایناوە، کە باوەڕیان بە خوای پاك و بێگەرد هێناوەو دانیان ناوە پەروەردگارێتیەکەی، هەروەها دانیان ناوە بەوەی پەرستراوێکی تاك و بێ هاوەڵە، تەنیاو بێ نیازە لە غەیری خۆی و هیچ هاوتایەکی نیە .

هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو مرۆڤ هەر لە دروستبوونی یەکەمیەوە، لە کڕنوش بۆ بردنی فریشتەکان بۆی بۆ خستە ڕووی ڕێز و پلە و پایەی، بەهۆی ئەوەی خوا فێری کردووە لە ناوو سیفەتی دروستکراوەکان، تا دەگاتە ئەو چاکەیەی خوا لەگەڵی کردو خستیە بەهەشتەوە، ئینجا دەرچوونی لە بەهەشت و پاشان دابەزینی بۆ سەر زەوی، دەستنیشان کرانی بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی و هەستان بە ئەرکی جێ نشینی تێیدا، ئا بەم جۆرە مرۆڤ لە دروستبوونی سەرەتایەوە بە کۆمەڵێك قۆناغ و چەندین ڕەوشی جیاوازدا گوزەری کردووە، لە هەموو ئەو قۆناغە جیاوازانەشدا کۆمەڵێك ئەڵقەی بەیەکەوە گرێدراوی گفتوگۆو موناقەشەو وەڵامدانەوەی پێویست هاوڕێی بوون و لێی جیانەبوونەتەوە.

## گفتوگۆی فریشتەکان:

لە ڕاستیدا کرداری دروستبوونی خودی مرۆڤ دەستی پێنەکرد پێش ئەوەی گفتوگۆ لە نێوان خوای بەدیهێنەری مەزن و پۆلێك لە فریشتە نزیکەکانی ڕوویدات، سەبارەت بە دروستبوونی مرۆڤ و کردنی بە جێنشین لەسەر زەوی و ئەگەرەکانی سەرکەوتنی لە ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی زەویدا: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ

﴿يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ۝٣٣﴾ البقرة: ٣٠ - ٣٣ .[1]

## مشتومڕە پووچەڵەکەی شەیتان:

یەکێك لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی لە دووتوێی قورئان و سورەتەکانیدا بە بەربڵاوی دەبینرێ، دەنگوسەدای ئەو مشتومڕەیە کە لەنێوان خوای بەخشندەو مەزن و شەیتانی نەفرین لێکراوو دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوادا ڕوویدا، کە تێیدا شەیتانی نەفرەت لێکراو مشتومڕ دەکات و وەڵام دەداتەوە، مۆڵەتی پێ دەدرێ بۆ خستنەڕووی قسەکانی، هەروەها گوێبیستی وەڵامەکان دەبێت — کە لەلایەن خوای زانا و داناوە وەڵامی دەدرێتەوە- ئەوە سەرەڕای کوفر و خۆبەگەورە زانین و بێ ئەدەبییەکەی، کاتێك خوای بەرزومەزن فەرمانی پێکرد کڕنووش بۆ ئەو دروستکراوە نوێیە و جێنشینە چاوەڕوانکراوە ببات کە ئادەمە - سەلامی خوای لەسەر بێت - ، بەڵام ئەو بێفەرمانی کردو خۆی بەگەورە زانی، کۆمەڵێك تانەی لەو فەرمانەی خوادا، کە بەدەر نەبوون لە نەفامی و بێ ئەدەبی، ئینجا خوای

---

[1] البقره ، ٣٠- ٣٣. واتە: باسی ئەوە بکە کە خودا فەرمووی بە فریشتەکان: من دەمەوێ لەسەر ڕووی زەوی جێنشینێ بۆخۆم دروست بکەم کە خاوەنی هێزی زانیاری و ئارەزووی نەفس و ڕق و قین بێ. ئەوانیش عەرزیان کرد: جۆرە مەخلوقی وەهات بۆچی یە کە لەوێ ئاژاوە بنێتەوەو خراپەکاری بکات و خوێن بڕێژێ، لە حاڵێکدا کە ئێمە سوپاس و ستایشت ئەکەین و تەقدیست ئەکەین و بەگەورەت ئەزانین؟ خوا لە وەڵامیاندا فەرمووی: ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن . جا لەبەر ئەوە کە خودای گەورە ئادەمی هەڵبژاردبوو بۆ جێنشینی خۆی، ناوی هەموو شتە پێویستەکانی فێرکردو تێی گەیاند. پاش ئەوە وێنەی ئەو شتانەی پیشانی فریشتەکان داو پێی فەرموون: ئادەی ئەگەر ڕاست ئەکەن ئێوە شایانی جێنشینی منن، یا ئەگەر ڕاست ئەکەن دروست کردنی ئادەم و ئادەمزاد کە ئەمە حاڵیان بێ بۆ شانی خودای گەورە ناشێ، ناوی ئەم شتانەم پێ بڵێن. کە فریشتەکان ناوی شتەکانیان نەزانی و دامان وتیان: خودایە تۆ پاك و بێخەوشی و ئێمە هیچ نازانین ئەوە نەبێ کە تۆ فێرت کردووین، هەر تۆ خۆت زانای بە هەموو شتێك و هەر خۆت لە هەموو کارێکدا خاوەن حیکمەتیت و هەر خۆت ئەزانی چی ئەکەیت . ئەنجا خوای گەورە فەرمووی: ئادەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پێ بڵێ و حاڵی یان بکە. کە ئادەم تێی گەیاندن خودا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن من پەنامەکی یەکانی زەوی و ئاسمان ئەزانم و هیچم لێ ون نابێ و ئەوەی دەری ئەبڕن و ئەوەی ئەیشارنەوە هەمووی پێ ئەزانم؟

بەخشندە و مەزن پرساری لێکرد لە هۆکارەکانی ئەو سەرپێچیە و پاڵنەرەکانی ئەو نەفامیەی: ﴿قَالَ يَـٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ۝٣٢﴾ الحجر: ٣٢ .[1]

لە بەرامبەردا شەیتانی نەفرەتلێکراو وەڵامێکی دایەوە کە لەوپەڕی خراپی دابوو، بەجۆرێك وەڵامەکەی لە کردارەکەی ناشیرینتر بوو﴿قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَـٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ۝٣٣﴾ الحجر: ٣٣ .[2] لەگەڵ ئەوەشدا دەستی کرد بە هێنانەوەی بیانووی پووچ و بەڵگەی لاواز، وەك ئەوەی گووتی: ﴿أَنَا۠ خَيۡرٌ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٍ ۝١٢﴾ الأعراف: ١٢ .[3] ئینجا لەدوای ئەوە هەم وەڵام و هەمیش سزای سەرپێچیەکەی بەیەکەوە پێگەیشت لەلایەن خوای زاناو داناوە: ﴿قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ۝٣٤ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٣٥﴾ الحجر: ٣٤ - ٣٥ .[4]

## جێنشینی تەوبەکار:

کاتێکیش خوای جیهانیان ئادەمی بەختەوەرکرد - سەلامی خوای لەسەر بێت - . بە چاکە و بەخشندەیی خۆی خستیە بەهەشتەوە، بەتووندترین شێوە وریایی پێدا لە بارەی شەیتان و نیازەخراپەکانی: ﴿فَقُلۡنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ۝١١٧﴾ طه: ١١٧ [5]، بەڵام ئادەم - سەلامی خوای لەسەر بێت - بەپێچەوانەی ئامۆژگاری خوای بەرزو مەزن ڕەفتاری کردو، ئەو وریایی دانە تووندەی لەیادکرد، لە ئەنجامی ئەوەدا گفتوگۆیەکی نوێ هاتە ئارا لەنێوان ئادەم کە فەرمانی خوای شکاندبوو و

(١) الحجر: ٣٢. واتە: خودا فەرمووی: ئیبلیس! ئەوە چیتە؟ بۆ لەگەڵ سوجدەبەرەکان نەبوویت؟

(٢) الحجر: ٣٣. واتە: ئیبلیس وتی: ڕەوا نیە من کڕنووش بۆ بەشەرێ بەرم لە خاکێکی ئاوازەداری سیاڕەنگ دروست کرابێ.

(٣) الأعراف: ١٢. واتە: من لەو باشترم، منت لە ئاگر دروستکردووەو ئەوت لە قوڕ دروستکردووە .

(٤) الحجر : ٣٤- ٣٥. واتە: خودا فەرمووی: دە دەرچۆ لە بەهەشت، چونکە تۆ دەرکراوی و لە ڕەحمەتی من بێ بەشی . تا ڕۆژی سزایش، لەلای منەوە نەفرینت لێ کراوە .

(٥) طه : ١١٧. واتە: بە ئادەممان وت: بەڕاستی ئەم شەیتانە دوژمنە بۆ تۆو بۆ ژنەکەت، دەسا ئاگاداربە دەرتان نەپەڕێنێ لە بەهەشت و گیرۆدەی ناڕەحەتی بیی.

لایدابوو، لەگەڵ پەروەردگاری بەخشندەو چاکەکاردا ﴿وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾﴾ الأعراف: ٢٢ .[1]
ئادەمیش ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ لەگەڵ خێزانەکەی (حەوا) وەلامێکی تێکەڵ بە داوای لێبوردنیان دایەوە: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ الأعراف: ٢٣ [2]، ئینجا خوای پەروەردگار لێیان خۆش بوو: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾ البقرة: ٣٧ [3].

## دانایی پێغەمبەران:

پاشان پێغەمبەران بە شێوازی دانایی (الحكمة) دەستیان پێکردو هەنگاویان نا، جوانترین رێگای گەیاندن و باشترین ئامرازی کارتێکردنیان هەڵبژارد، کە بریتیە لە رێگای "گفتوگۆ و مشتومڕ و بەڵگەهێنانەوە" ئەوانەیان لەگەڵ چەند هۆکارێکی تر کردە میتۆدو پرۆگرامی خۆیان و پەیامەکانی خوایان پێی ڕادەگەیاند، لەو کارەشیاندا تەنها لەخوا دەترسان و لە کەسی تر ترسیان نەبووە، ئەوان لەو رێبازی کارکردنەدا ئامانجی خۆیان بینیوەتەوەو گەیشتوون بە داواکەیان کە رێنمایی کردنی ئەوانەیە کە بەدوای رێنموونیەوەن، نەهێشتنی بەڵگەشە بەدەست ئەوانەوە کە خۆیان بەگەورە دەزانن و ملکەچ نابن .
هەرگیز پێغەمبەران ـ درودی خوایان لەسەر بێت ـ ترسیان نەبووە لە چوونە ناو پرۆسەی گفتوگۆو خۆیان لێی نەبواردووە، ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی بە ڕوونترین ڕاستی و ئاشکراترینی بەڵگەنەویستەکانیشەوە هەبووبێت: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ

---

(١) الأعراف : ٢٢. واتە: ئینجا خودا بانگی (ئادەم و خێزانەکەی) کردو فەرمووی: ئایا من مەنعم نەکردن لە خواردنی بەری ئەو دارە؟ ئایا پێم نەوتن کە بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی دیاری و ئاشکراتانە؟

(٢) الأعراف : ٢٣. واتە: وتیان: ئەی خودای پەروەردگارا ئێمە ستەممان لەخۆمان کرد، تۆ ئەگەر لە گوناهمان خۆش نەبی و ڕەحممان پێ نەکەی لە زومرەی زیانباران ئەبین.

(٣) البقرة : ٣٧. واتە: ئینجا ئادەم چەند کەلیمەیەکی لە خوداوە وەرگرت و کەوتە سەر ڕێگای پەشیمانبوونەوە و لە خودای گەورە پاڕایەوە، ئەویش نزاو پاڕانەوەو پەشیمان بوونەوەکەی پەسەند کردو لێی خۆش بوو، بێگومان خودا تەوبە وەرگرە و زۆر میهرەبانە.

نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى قَالُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾﴾ إبراهيم: ٩ – ١٠ [1].

ئا بەو شێوەیە گفتوگۆیان کردوەو چوونەتە ناو مشتومڕو موناقەشەوە لەبەر حەزکردنیان بە ڕێنماییکردنی خەڵك و بەئومێدی گەیشتن بە سەلامەتیان، جا کۆمەڵێك باوەڕیان پێ هێناون و کۆمەڵێکی تریش بێباوەڕبوون پێیان، زمانی حاڵی پێغەمبەرانیش ئەوەبووە کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ جَاءَكُم بَصَائِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾﴾ الأنعام: ١٠٤ [2].

(١) إبراهيم: ٩ـ ١٠. واتە: ئایا دەنگوباسی ئەوانەتان پێ نەگەیشتووە کە پێش ئێوە بوون لە گەلی نووح و عاد و سەموود و ئەوانەیش لە پاش ئەوان بوون کە خودا نەبێ کەس پێیان نازانێ . پێغەمبەرەکانیان بە موعجیزەوە هاتن بۆ لایان و ئەوان دەستیان ئەبرد بۆ دەمیان و لە داخی قسەی پێغەمبەرەکان پەنجەی خۆیان ئەگەست و بە پێغەمبەرەکانیان ئەوت ئێمە باوەڕمان نییە بەوەی لەگەڵتان نێرراوە . ئێمە گومانێکی وامان هەیە ئەمانخاتە دوودڵییەوە لەو شتەی بانگمان ئەکەن بۆی کە ئیمان هێنانە . جا پێغەمبەرەکانیان وتیان : ئایا گومان هەیە لە بوونی خودایەکدا کە ئافەریدگاری ئاسمانەکان و زەوییە و بانگتان ئەکات بۆ ئەوەی لە تاوانەکانتان خۆش بێ، مۆڵەتیشتان بدات بۆ ئەوەی تا ماوەیەکی دیاریکراو بژین .کافرەکان بە پێغەمبەرەکانیان وت : ئێوە لە بنیادەمێکی وەك ئێمە بەو لاوە نین، ئەتانەوێ ڕێمان لە پەرستنی ئەو شتانە لێ بگرن کە باووباپیرانمان پەرستوویانن . کەواتە دەلیلێکی ئاشکرامانبۆ بێنن ئیسپاتی قسەکەتان بکات کە ڕاستگۆن .

(٢) الأنعام : ١٠٤. واتە: ئەی پێغەمبەرا پێیان بڵێ: بە ڕاستی لەلایەن خوداوە چەند ئایەتتان بۆ هاتووە بەرچاوی ڕۆشن کردوونەتەوە . جا ئیتر هەرکەس بەرێی خۆی ببینێ و ڕێگای ڕاست بگرێ ئەوە قازانجی خۆیەتی، ئەوەیش خۆی کوێر بکا و لە ڕێی ڕاست لابدات ئەوا خۆی زەرەر ئەکات، ئیتر من هیچم بەدەست نیە، من تەنها پێ وتن و ڕاگەیاندنم لەسەرە .

## کۆتاییەکەی میسکە:

لە کاتێکدا کە زنجیرەی پێغەمبەران بە موحەمەد ـ درودی خوای لەسەر ـ کۆتایی هات وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ۝٤٠﴾ الأحزاب: ٤٠ .[١]

لەکاتێکدا دڵی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ تێکڕای ئەزموونی مرۆڤایەتی لە بانگەواز و گەیاندنی پەیامەکەیدا لەخۆیدا کۆکردبۆوەو لێی تێگەیشتبوو، هەر ئەو دڵە قورئانی پیرۆزیشی وەرگرتبوو کە پوختەی ئەزموونی پێغەمبەرایەتی و پاڵفتەی زێری و دانایی مرۆڤایەتی و دەستەبژێری بیروبۆچوونە دروستەکانی لەخۆگرتوو، بۆیە پێغەمبەر موحەمەد ـ درودی خوای لەسەر ـ بەڕاستی ئەو میسکە بۆنخۆشەیە کە خواردنەوەی بەهەشتیەکانی پێ سەرمۆر دەکرێ، وەك نیشانەی بەرزترین چێژو شیرینترین تام و خۆشترین بۆن، بێگومان گرتنەبەری ڕێگای گفتوگۆ لەلایەن پێغەمبەرەوە ـ درودی خوای لەسەر ـ و هەڵبژاردنی وتوێژێك بە شێوازی جوان وەك ڕێگای سەرەکی لە بانگەوازدا باشترین بەڵگەیە لەسەر باڵادەستی و تێروتەواوی دەروون و فراوانی ئاسۆی بیرکردنەوەو تێگەیشتنی جوانی ئەو پێغەمبەرە درودی نەبڕاوەی خوای لەسەر بێت .

---

[١] الأحزاب: ٤٠. واتە: موحەممەد باوکی هیچ یەکێك لە پیاوانی ئێوە نەبووە، بەڵام نێردراوی خواو دوا پێغەمبەری خوایەو خوا بە هەموو شتێکی زانیوەو ئەزانێ .



**بابەتەکانی ئەم کتێبە و باسە سەرەکیەکانی:**

**ئەم کتێبە پێکدێت لە:**

یەکەم: **ڕێخۆشکردن و پێشەکی**

دووەم: **نمونەکانی گفتوگۆ لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوادا ـ درودی خوای لەسەر ـ ئەوانیش هەشت باسن:**

باسی یەکەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوبەشدانەران (المشركين).**

باسی دووەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ خاوەن کتێبەکان (جولەکە و گاورەکان).**

باسی سێیەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ گەلانی خاوەن شارستانیەت و ئازاددا.**

باسی چوارەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ بکوژو پیلانگێراندا.**

باسی پێنجەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوەڵان.**

باسی شەشەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ گەنجان و هەرزەکاراندا.**

باسی حەوتەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوسەرەکانی و ئەندامانی خێزانەکەی.**

باسی هەشتەم: **گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ فریشتە بەڕێزەکاندا.**

سێیەم: **کۆتایی**

# پێشەکی:

## پێناسەی گفتوگۆ و مشتومڕ:

گفتوگۆ و مشتومڕ: بەیەکگەیشتن و لەیەکتر جیابوونەوەن .

## (الحوار) لە زمانی عەرەبدا:

لە (حَوْر) موە وەرگیراوە کە بە مانای گەڕانەوە لە شتێك یان بۆلای شتێك دێت[1].

شاعیر گوتوویەتی:

وَمَا الْمَرْءُ إلاَّ كالشِّهابِ وضَوْئِهِ          يحورُ رَماداً بَعْدَ إذْ هُوَ ساطِعُ

واتە: مرۆڤ هەر وەك ئەستێرەی ڕاکشاوو تیشکەکەی وایە کە دەبێتەوە بە خۆڵەمێش لەکاتێکدا پێشتر بریسکەدار بووە .

## لە کتێبی (الصحاح) د هاتووە[2]:

حار يحور حوراً: گەڕایەوە، هەر بەو مانایە خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ١٤﴾ الانشقاق: ١٤ [3].

## لە (القاموس المحيط) دا هاتووە:

وتحاوروا: أي تراجعوا الكلام بينهم: پێداچوونەوەی قسەیان کرد لەنێوان خۆیاندا.

والتحاور التجاوب: تحاوریش بە مانای وەڵامدانەوەی یەکتریە[4].

---

(١) الحوار آدابه وضوابطه في ضوء الكتاب والسنة (يحيى محمد زمزمي) ص: ١٩ .

(٢) الصحاح في اللغة ٢/٦٣٨ .

(٣) الانشقاق : ١٤. واتە: گومانی وابوو کە ناگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو خاوەنەکەی .

(٤) القاموس المحيط ٢/١٦ .

**والمحاورة:** مراجعة المنطق والكلام في المخاطبه[1]؛ محاوەرەش ماناى گەڕانەوەیە بۆ لۆجیك و (زانستی کەلام) لە دواندنی بەرامبەردا .

## پوختەی قسان لەبارەی ماناى (حوار) لە زمانی عەرەبیدا:

بریتییە لە دووبارەکردنەوەی قسە و دواندنی یەکتری بە قسە لەگەڵکردن و وەڵامدانەوەی بەرامبەر.[2]

منیش دەڵێم: شایەتی ئەو مانایە فەرموودەی خوایە کە باسی ئەو شتانە دەکات کە لەنێوان بێباوەڕاندا دەگوزەرێ لە ڕۆژی دواییدا: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾﴾ سبأ: ٣١ .[3]

## وشەی (الحوار) لە سێ شوێنی قورئاندا هاتووە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ﴿وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾﴾ الكهف: ٣٤ .[4] لێرەدا بە ماناى: قسەی بۆ دەنێرێتەوەو وەڵامی دەداتەوە، هاتووە[5] .

---

(١) لسان العرب ٢١٧/٤ .

(٢) الحوار آدابه وضوابطه في ضوء الكتاب والسنة (يحيى محمد زمزمي) ص: ١٩ .

(٣) سبأ : ٣١. واتە: جا ئەگەر ئەو ڕۆژە بە چاوی خۆت ئەبینی کە ستەمکاران لای خوا ڕاوەستێنراون دەمەتەقێیانە و هەر کامیان قسە ئەدا بە سەر قسەی ئەوی تریاندا و ئەوانەیان لە دونیادا بێ دەسەڵات و ژێردەست بوون بە گەورە و دەسەڵات بەدەستەکانیان ئەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە هەموومان موسوڵمان ئەبووین.

(٤) الكهف : ٣٤. واتە: خاوەنی دوو باغەکە بێجگە لەو دوو باغە ماڵ و سامانیشی هەبوو . جا ئەم پیاوە ڕۆژێ لە کاتی قسە لەگەڵ کردندا بە هاوڕێکەی وت : من دارایی و ماڵ و سامانم لە تۆ زۆرترەو لە تۆ زیاتر پایەو قەدرم هەیە .

(٥) زبدة التفسير للأشقر، ص: ٣٨٥ .

٢- ﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ٣٧﴾ الكهف: ٣٧ .[١] لێرەش هەر بەمانای: قسەی لەگەڵ دەكات و وەڵامی دەداتەوە، هاتووە .

٣- ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١﴾ المجادلة: ١ .[٢] لێرەدا بە مانای: خوا دەبیستێ ئەو قسانەی بۆ یەكتری دەڵێنەوە، هاتووە.[٣]

## پوختەی قسە لەبارەی مانای (حوار) لە قورئانی پیرۆزدا ئەوەیە:

ئاڵوگۆڕكردنی قسە و گفتوگۆ و وەڵامدانەوەیە .

## وشەی (الحوار) لە فەرموودەدا بەچەند جۆرێك هاتووە كە بریتین

**لە:** (حار، الحَوْر، محاورە) ماناكانیشیان جیاوازن:

حَارَ: لە ئەبوزەری غیفاری - خوا لێی ڕازی بێت - گێڕراوەتەوە كە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرموویەتی: (وَمَنْ دَعَا رَجُلًا بِالْكُفْرِ، أَوْ قَالَ: عَدُوُّ اللهِ وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِلَّا حَارَ عَلَيْهِ) واتە: هەر كەسێك كەسێك بانگ بكا بە بێباوەڕ، یان بڵێ: دوژمنی خوا، ئەو كەسەش وانەبێ، ئەوە بێگومان قسەكە دەگەڕێتەوە سەرخۆی . حار علیه: واتە: دەگەڕێتەوە سەرخۆی .

الحَوْر: لە عەبدوڵڵای كوڕی سەرجەسی موزەنییەوە - خوا لێی ڕازی بێت - گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی:

---

(١) الكهف : ٣٧. واتە: هاوڕێ موسوڵمانەكەی كە قسە و گفتوگۆی لەگەڵ نەكرد پێی وت : ئەوە كوفرت كرد و باوەڕت بەو خودایە نیە سەرەتا لە خۆڵ و دوایی لە دڵۆپێك دروستی كردیت، پاشان كردیتی بە مرۆڤێكی نێر و گەیاندیتیە پایەی پیاوان؟

(٢) المجادلة: ١. واتە: بەڕاستی خوا گوێی لە دەنگی ئەو ژنەوە بوو كە لەگەڵت كەوتبووە موجادەلە لەبارەی مێردەكەیەوەو دادی خۆی ئەبردە لای خواو، خوا گوێی لە گفتوگۆی ئێوەویە . خوا بیسەرو بینایە.

(٣) زبدة التفسیر للأشقر، ص: ٧٢٤.

(كانَ رسولَ الله ﷺ إذا سافرَ يتعوّذ منْ وعثاءِ السفر (**أي الشدة والمشقّة**)، وكآبة المنظر (**أي تغير النفس من الهم والحزن**)، والحَور بعد الكَور (**أي النقصان وفساد الأمور بعد الزيادة**) ودعوة المظلوم وسوء المنظر في الأهل والمال). [1]

**والحَور بعد الكَور:** واتە پاشەکشێکردن لە دامەزراوی (**الاستقامة**) و کەمکردن لە دوای زیادبوون [2].

**محاورة:** لە ئەبودەردائەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی: (لە نێوان ئەبوبەکر و عومەردا مشتومڕ (**محاورة**) یەك دروستبوو جا ئەبوبەکر تووڕەبوو عومەریش بە تووڕەییەوە لەلای ڕۆیشت، ئەبوبەکر بەدوای کەوت داوای لێکرد لێی ببوورێ، بەڵام قبوڵی نەکرد و دەرگای بەڕوویدا داخست، ئینجا ئەبوبەکر ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ ئەبودەردا گووتی ئێمەش لەلای بووین، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەم هاوەڵەتان (ئەبوبەکر) هەوڵی داوەو پێشبرکێی کردووە لە پێناو چاکەدا، دەڵێ عومەریش پەشیمان بوویەوە لەو کارەی کردبووی و هات و سەلامی کردو لەلای پێغەمبەری خواوە ـ درودی خوای لەسەر ـ دانیشت و بەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ گێڕایەوە، ئەبودەردا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ تووڕەبوو، ئەبوبەکریش هەر پێی دەگووت سوێند بەخوا من ستەمکارتر بووم ئەی پێغەمبەری خوا، ئنجا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەرێ واز لە هاوەڵەکەم دێنن، ئەرێ واز لە هاوەڵەکەم دێنن؟ من کە هاتم گووتم

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الحج — باب ما يقول إذا ركب إلى سفر الحج وغيره، برقم: ٢٤٧٩ . واتە: پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ کاتێك سەفەری دەکرد پەنای دەگرت بەخوا لە سەختییەکانی سەفەر (واتە تەنگانەو ماندووبوون)، لە دڵتەنگی لەسەر ڕوخسار (واتە تێکچوونی باری دەروونی بەهۆی خەم و خەفەتەوە)، لە کەمکردنی دوای زیادبوون (واتە کەمهێنان و خراپ بوونی کاروبار لەدوای چاکی و زۆرییەوە) وە لە نزای ستەملێکراوو دیمەنی خراپ لەناو خێزان وماڵدا .

(٢) انظر التمهيد لما في الموطأ من المعاني: ٢٤/ ٣٥٣ . وانظر النهاية في غريب الحديث الأثر: ٤/ ٣٥٨ .

ئەی خەڵکینە من نێرراوی خوام بۆ لای ئێوە بە تێکڕا، هەمووتان گووتتان درۆت کرد، بەڵام ئەبوبەکر گووتی ڕاست دەکەی)[1].

## پوختەی قسان لەبارەی پێناسەی (الحوار) دوای خستنەڕووی ماناکانی لە ڕووی زمانەوانی و لە قورئان و سوننەتدا:

لە پێناسەی (الحوار: گفتوگۆ) دا لەو کتێبانەی خوێندوومنەوە سێ پێناسەم بەرچاو کەوتوون کە هەرسێکیان جوانن:

### ١ـ ئاڵوگۆڕکردنی قسە لە نێوان دوو لایەندا[2].

ئەوەی لەم پێناسەیە وەردەگیرێت باسنەکردنی حاڵەتی گفتوگۆکارەکانە لە ڕووی ئاداب و میتۆدی قسەکردنەوە، هەروەها ئەوەشی لێ دەگیرێت کە وێنای گشتی گفتوگۆکەی نەکردووەو ڕوونی نەکردۆتەوە، چونکە عادەتەن جیاوازی هەیە لە نێوان گفتوگۆ و مشتومڕدا، یەکەمیان هێمنی بەسەریدا زاڵەو، دووەمیان دەمارگیری زاڵە بەسەریدا .

### ٢ـ گۆڕینەوەی قسە لەنێوان دوو لایەن یان زیاتردا کە مەرج نیە نەیاری یەکتربن[3]:

ئەمەیان پێناسەیەکی باشە، چونکە بازنەی گفتوگۆکەی بەجۆرێك فراوان کردووە کە زیاتر لە دوو کەس لەخۆبگرێت، ئاماژەشی بە ئادابی گشتی گفتوگۆ کردووە کە بریتییە لە هێمنی و نەبوونی ململانێ .

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن – تفسير سورة البقرة ، باب (يا أيها الناس إني رسول الله إليكم جميعا) برقم: ٤٣٨٢ .

(٢) الحوار مع أصحاب الأديان مشروعيته وشروطه وآدابه، أحمد بن سيف الدين تركستاني ص/٥ .

(٣) الحوار آدابه وضوابطه في ضوء الكتاب والسنة، يحيى محمد زمزمي ص/٢٢ .

**٣ـ گفتوگۆی نێوان دوو لایەن کە ئاڵوگۆری قسە دەکرێ لەنێوانیاندا بە شێوەیەکی هاوتاو هاوسەنگ، کە هیچ کامیان باوادرێ بەسەر ئەوی تردا، هێمنی و دووری لە رقەبەرایەتی و دەمارگیری زاڵە بەسەریدا**[١] .

من پێناسەی سێیەمم هەڵبژاردووە چونکە لە هەموو پێناسەکان وردترو گشتگیرترە.



(١) في أصول الحوار، وحدة البحوث بالندوة العالمية للشباب الاسلامي ص/ ١١ .

# (الجدل) لە زمانی عەرەبدا

## المجادلة:

لە (الجَدْل)ەوە هاتووە کە بە مانای هۆنینەوەی توونە دێت، دەگوترێ (جَدَلْتُ الحبل جدلاً) واتە پەتەکەم توونە هۆنیەوە و گرێم دا بە پەتەوی، (الجديل) یش بەمانای ڕێشمەی وشتر دێت .

امرؤ القيس دەڵێ:

وجدلٍ لطيف كالجديل مُخصّرٍ وساق كأنبوب السَّقِيِّ المُذلَّلِ[1].

الجَدَلُ: واتە: ڕقەبەرایەتی لە کاتی ململانێ و دەسەڵات هەبوون بەسەریدا[2] .

وجادَله: واتە ململانێی لەگەڵ کرد[3] .

(دەگوترێ) رجلٌ جَدِلٌ: بۆ کەسێك کە زاڵتر بێت لە مشتومڕدا .

منیش دەڵێم: پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ لە فەرموودەدا زەمی ئەو کارەی کردووە (إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الخَصِمُ)[4] .

## پوختەی قسان لەبارەی مانای (الجدل) لە زمانی عەرەبیدا:

**(جدل) لە زماندا:** بریتییە لە توندی و هێز و قایمکردنی شت .

---

(١) انظر الصحاح في اللغة ٨٣/١ . واتە: هۆنینەوەیەکی نەرم وەکو ڕێشمەی وشتر کەمەری باریکە، قاچێك وەکو بۆری ئاودێری ملکەچکراو (سەرەوژێرکراو).

(٢) لسان العرب ١٠٥/١١ .

(٣) الصحاح ١٦٥٣/٤ .

(٤) أخرجه البخاري في كتاب تفسير القرآن "سورة البقرة" باب وهو ألد الخصام عن عائشة رضي الله عنها برقم ٤٢٦٩ . واتە: ئەوەی خوا لە هەموو کەس زیاتر ڕقی لێیەتی ئەو کەسەیە خراپەکارە لە مشومڕدا .

شێخ محمد الامین الشنقیطي دەفەرموێ: المجادلة: بریتییە لە ململانێیەك کە مەبەست لێی دەرخستنی ڕاستی نەبێت، بەڵکو بۆ ملشکاندنی بەرامبەر بێت[1].

## (جدل) لە قورئانی پیرۆزدا:

وشەی (الجدل) مشتومڕ، بە شێوە زۆرەکانیەوە لە قورئانی پیرۆزدا لە ٢٩ جێگادا هاتووە کە هەموویان بۆ بەخراپدانانی هاتوون تەنها سێ شوێن نەبێت:

١- ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥﴾ النحل: ١٢٥ .[2]

مەبەست لە (مجادله) لێرەدا: واتە هەر کەس لەوان پێویستی بە مونازەرەو مشتومڕ هەبوو، با شێوازێکی جوان و لەسەرخۆ و قسەی نەرم بێت[3].

٢- ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٤٦﴾ العنكبوت: ٤٦ .[4]

---

(١) انظر آداب البحث والمناظرة ٧٥/٢ .

(٢) النحل : ١٢٥ . واتە: خەڵك بانگ بکە بۆ ڕێگای خوداو بۆ ئیسلام بوون بە شێوەیێ کە موافیقی ئەقڵ و هۆشی ساغ بێ، هەروەها بەپەند و ئامۆژگاری جوان. ئەگەر شوێنەکەیش شوێنی موجادەلە بوو کە بەرانبەر ئەیەوێ قسەی خۆی بباتە سەر، ئەوە پێویستە بەباشترین شێوە قسەی لەگەڵ بکەی. بێگومان خودای تۆ زاناترە کە کێ لە ڕێی ڕاست لائەدا و کێ ڕێگای ڕاست ئەگرێتەبەر .

(٣) انظر تفسیر ابن کثیر ٦١٣/٤ .

(٤) العنکبوت : ٤٦. واتە: دەمەقاڵە مەکەن لەگەڵ کەسانی سەر بەو ئاینانەی خوا کاتی خۆی کتێبی ناردوونەتە سەر بە باشترین شێوەی گفتوگۆ نەبێ، تەنها ئەوانەیان نەبێ کە ستەمکارن و دەم درێژی دەکەن و بڵێن : ئێمە باوەڕمان بە قورئان هەیە کە لە خواوە هاتۆتە خوار بۆمان و بە تەورات و ئینجیل و زەبوور و ئەو کتێبانەی تر کە لە خواوە هاتونەتە خوار بۆ ئێوە، خوای ئێمەو ئێوە هەر یەك خوایەو ئێمە گەردنکەچین بۆ ئەو خوایە.

(ولا تجادلوا) لێرەدا: واتە دروستی و ڕێگەپێدرانی مشومڕ تایبەتە بەو شوێنانەی بەرژەوەندی و سوودی کردنی زیاتر بێت لە زیانەکانی، یان بەو شوێنانەی مشتومڕەکە بە باشەیە نەك بە زبری[1].

٣- ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ۝١﴾ المجادلة: ١[2]

تجادلك في زوجها: واتە قسەت بۆ دووبارە دەکاتەوە لەبارەیەوە[3].

## (جدل) لە فەرموودەدا:

لە فەرموودەشدا وەك قورئان تێکڕای ئەو دەقانەی لەبارەی مشتومڕەوە هاتوون بە ئاڕاستەی زەمکردنیدا دەچن لەوانە:

فەرموودەی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ کە دەفەرموێ: (مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الجَدَلَ) واتە: هیچ کۆمەڵێك نیە گومڕابووبن دوای ئەوەی لەسەر هیدایەت بوون ئیللا مشومڕیان دراوەتێ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ۝٥٨﴾ الزخرف: ٥٨[4][5]

لەگەڵ ئەوەشدا لە فەرموودەی پیرۆزدا لە چەند شوێنێکی کەم مشتومڕ بەشێوەی ستایش و پەسەند کردن هاتووە لەوانە:

---

(١) بڕوانە فتح القدير للشوكاني ٤٧٧/١ .

(٢) المجادلة : ١. واتە: بە ڕاستی خوا گوێی لە قسەی ئەو ژنە بوو کە لەگەڵت کەوتبووە موجادەلە لەبارەی مێردەکەیەوەو دادی خۆی ئەبردە لای خوا، خوا گوێی لە گفتوگۆی ئێوەوەیە . خوا بیسەر و بینایە.

(٣)بڕوانە: فتح القدير للشوكاني ١٦٥/٧ .

(٤) الزخرف : ٥٨. واتە: هەر بۆ دەمەدەم ئەیهێننەوە و لەوە زیاتریش ئەمانە خەڵێکن زۆر بە توندی دوژمنایەتی ئەکەن و حەزیان لە عەناد و کەللەڕەقیە.

(٥) أخرجه الترمذي في أبواب تفسير القرآن عن رسول الله ﷺ- باب: ومن سورة الزخرف برقم: ٣٢٩٣ عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه، وقال حديث حسن صحيح .

پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ دەفەرموێ: (مَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ فِي الْحَقِّ يَكُونُ لَهُ فِي الدُّنْيَا بِأَشَدَّ مِنْ مُجَادَلَةِ الْمُؤْمِنِينَ لِرَبِّهِمْ فِي إِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ أُدْخِلُوا النَّارَ).[1]

منیش دەڵێم: مشتومڕ هەر کات بەڕەهایی باسکراو نەبەسترایەوە بە چاکەوە ئەوە بەزۆری وایە بەناپەسەند دانراوە، لەبەر ئەو فەرموودە بەناوبانگەی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ کە دەفەرموێ: (أنا زعيم ببيت في رَبَضِ الجنة لمن ترك المراء وإن كان محقاً، وببيت في وسط الجنة لمن ترك الكذب وإن كان مازحاً، وببيت في أعلى الجنة لمن حَسُنَ خُلُقُه)[2].

## پێناسەی مشتومڕ:

**مشتومڕ وەك زاراوەدا:** بریتییە لەوەی دوو لایەنی ناکۆك بیروبۆچوونەکانی خۆیان بەرامبەر یەکتر بەرزبکەنەوە بەجۆرێك کە قسەکانیان ململانێ و ڕەتکردنەوەی تێدا بێت یان هەر شتێکی تر کە جێگەیان بگرێتەوە لە ئامانجو مانا[3].

## زانیارییەکی سوودبەخش:

مشتومڕ بە ڕەهایی نە فەرمانی پێکراوە نە بەباش دانراوە لە قورئان و فەرموودەدا، تەنها کاتێك بەباش دانراوە کە بەسترابێتەوە بە چاکەو ڕاستیەوە .

---

(١) أخرجه النسائي في السنن الصغرى في كتاب الإيمان وشرائعه — باب زيادة الإيمان برقم: ٤٩٥٨ عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه، وصححه الألباني في تعليقه على السنن وهو عنده برقم: ٤٦٣٧ . واتە: هیچ مشتومڕێکی ئێوە لەسەر حەقێکی لە دنیادا توند نیە هێندەی مشتومڕی ئیمانداران لەگەڵ پەروەردگاریان لەسەر ئەو برایانەیان کە خراونەتە ئاگرەوە .

(٢) أخرجه أبوداود في سننه في كتاب الأدب — باب في حسن الخلق برقم: ٤٢٢٣ ، عن أبي أمامة الباهلي رضي الله عنه . واتە: من دەستەبەری ماڵێك دەکەم لە لای خوارەوەی بەهەشت بۆ هەر کەسێك واز لە شەڕەقسە و دەمبەدەمە بێنێ ئەگەر لەسەر هەقیش بێت، ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشت بۆ هەر کەسێك واز لە درۆ بێنێت ئەگەر بۆ گاڵتەشی بێت، وە ماڵێك لەسەرووی بەهەشت بۆ ئەو کەسەی ڕەوشتی جوان بێت .

(٣) الحوار مع أصحاب الأديان مشروعيته وشروطه وآدابه، أحمد بن سيف الدين تركستاني ص٩ .

## جیاوازی نێوان گفتوگۆ و مشتومڕ:

زانایان گفتوگۆ و مشتومڕیان لەیەك جیاکردۆتەوە بەوەی مشتومڕ ڕێگەیەکە ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرێ دەمارگیری و سووربوون لەسەر سەرخستنی بیروڕا و سەرخستنی نەفس بە حەق و ناحەق و ناڕەوایی لە هێنانەوەی گومان و دوودڵی بەرامبەر حەقێك کە لە لای بەرامبەرەوە بێت[1].

لە نێوان گفتوگۆ و مشتومڕ دا ئەو جیاوازیە هەیە کە هەردووکیان لەوەدا بەیەك دەگەن کە بریتین لە قسەکردن و بەرەوڕووکردنەوەی قسە لە نێوان دوو لایەندا، بەڵام لەوەدا لەیەك جیا دەبنەوە کە مشتومڕ ڕقەبەرایەتی و ململانێی تێدایە، بەڵام لە گفتوگۆدا هێمنی و خۆدوورگرتن لە دەمارگیری زاڵە بەسەریدا[2].

## گفتوگۆی هاوچەرخ:

لەوەی ڕابورد دەردەکەوێ کە گفتوگۆ بریتییە لە ئاڵوگۆڕی زانیاری و هزر و بۆچوون، جا بە نووسین بێت یان زارەکی، گفتوگۆ هەر بەخودی ئاشنابوون لەگەڵ ڕاوبۆچوونی کەسانی ترو سەرنجدان و هەڵسەنگاندن و قسەلەسەر کردنیان دێتەدی، هەر بەم تێگەیشتنە دەتوانین بڵێین گفتوگۆ کارلێککردنی کەلتورەکان لەگەڵ یەکترو ئەوەی لەمەوە دێتە بوون لە بەیەکگەیشتنی گفتوگۆکاران و ڕاستکردنەوەی هەندێك بۆ ئەوانی ترو کاریگەریان بەسەر یەکترەوە دەگرێتەوە.[3]

## گفتوگۆ ڕەوشتی ئەو بوو:

سەعدی کوڕی هیشامی کوڕی عامر ـ خوای لێی ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە دەڵێ: چوومە لای عائیشە ـــ خوا لێی ڕازی بێت ـــ گووتم: ئەی دایکی ئیمانداران، باسی ڕەوشتی

---

(١) الحوار مع أصحاب الأديان مشروعيته وشروطه وآدابه، أحمد بن سيف الدين تركستاني ص٩ .

(٢) الحوار مع أصحاب الأديان مشروعيته وشروطه وآدابه، أحمد بن سيف الدين تركستاني ص١٠ .

(٣) الحوار مع أصحاب الأديان مشروعيته وشروطه وآدابه، أحمد بن سيف الدين تركستاني ص١٠ .

پێغەمبەری خوام بۆ بکە ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: (ڕەوشتی ئەو قورئان بوو. ئایا قورئانت نەخوێندۆتەوە کە خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ④﴾ القلم: ٤[١]. گووتم: دەمەوێ خۆم گۆشـــەگیر بکەم بۆ عیبادەت، فەرمووی: وامەکە، ئەوەت نەخوێندۆتەوە کە خوا دەفەرمـــوێ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ الأحزاب: ٢١[٢]، دەی پێغەمبەری خوا ژنی هێناوەو منداڵیشی هەبووە[٣].

کەواتە هەر ڕەوشتێکی پەسەند لە قورئاندا هاتبێت ئەوە ڕەوشتی ئەویش بووە ـ دروودی خوای لەسەر ـ و هەر بەهایەکی بەرز لە قورئاندا هەبێت ئەوە بەشێکی دانەبڕاو بووە لە ڕەفتارو مامەڵەی ئەو، چونکە ڕوحی ئەو بە قورئان ئاو درابوو، لە سەرەتاکانیەوە تێکەڵ بە وەحی بووبوو، لە ناخی گیانی دا جێگیر بوو، بە قوڵایی دڵیدا ڕۆچوو بوو، بۆیە ڕەوشتە قورئانیەکان لە ئەندامەکانیە، وە سەریان دەکرد و ئادابە قورئانیەکان لە وشە و جووڵە و وچانەکانی دەچۆڕان، بەم جۆرە پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ قورئانێکی زیندووی گۆیا بوو لەسەر شێوەی مرۆڤێك لە گۆشت و خوێن .

بێگومان یەکێك لە دیارترین ڕەوشتە قورئانیەکانیش کە زۆر ترین جار دووبارە بوەتەوە و لە هەمووان زیاتر بڵاوبۆتەوە لەو پەڕاوە دەستەوسانکەرەدا بریتییە لە "ڕەوشتی گفتوگۆ" .

## قورئان و گفتوگۆ:

قورئان هەر هەمووی لەسەرەتاوە تا کۆتایی لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری "کتێبی گفتوگۆیە" لەمەش دا جیاوازی نیە لە نێوان سوورەت و ئایەتە مەکەیی و مەدینەییەکاندا، ئەگەر سەرنج بدەی ئەم ویستە بۆ گفتوگۆ و باوەڕ پێهێنان (الاقناع)، پرسیار و وەڵام، قسەکردن

---

(١) القلم : ٤. واتە: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی.

(٢) الأحزاب : ٢١. واتە: لە پێغەمبەری خوادا پێشەنگیەکی جوان هەیە بۆ ئێوە.

(٣) أخرجه أحمد في مسنده في مسند الأنصار — حديث السيدة عائشة رضي الله عنها، برقم: ٢٤٠١٠ ، وقال عنه الألباني في صحيح الأدب المفرد (٢٣٤): صحيح لغيره. وقد أورده رحمه الله في صحيح الجامع برقم: ٤٨١١ وقال: حديث صحيح .

و وەڵامدانەوەی لە ڕێی عەقڵ و لۆجیکەوە، لە بابەتە جیاوازەکانی قورئانی پیرۆزدا بەرچاو دەکەوێ، چونکە بانگەوازی قورئان بانگێکە ڕێزی عەقڵ دەگرێت، هانی وەڵامکاری و هەڤپەیڤین دەدات، قبوڵی فرە بیروڕایی دەکات، ئەمەش نەك بەمەبەستی یەکتر ڕازیکردن و وەستان لە سنوری جۆراوجۆری سروشتی خەڵك و بەس، بەڵکو بەمەبەستی گفتوگۆکردن بەیەکەوە و وەڵامکاری و تێکەڵکردنی بیرو هزرەکانیش، هەموو ئەمانەش لە چوارچێوی گەڕان بە دوای ڕاستی و بەیانکردنیدا و هاندان بۆ دەست پێوەگرتن و پێداگرتن لەسەری، هەروەها دەرخستنی پێچەوانەکەی کە شتی پووچ و ناڕاستە و ڕەواندنەوەی خەڵك لێی و بەربەرچ دانەوەی .

## گفتوگۆ ڕێبازی بانگەوازی موحەممەدیە:

گفتوگۆ نیشانەیەکی جێگیرو چەمکێکی قوڵ بووەوەیە لە هەموو قۆناغەکانی سەرگوزەشتەی پێغەمبەرێتی و وێستگە جۆربەجۆرەکانی بانگەوازی موحەممەدی دا، وەك دەبینی خۆشەویستترین قسە لای خەڵك و نزیکترینی لە دڵەکانیانەوە و ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر جێگەی پەسەندە لەلایان بریتییە لە وەڵامگۆیی (التجاوب) کە تێیدا بیسەرو بێژەر بەشدار دەبن لە دەربڕین بەزمان و بیرکردنەوەو وەگەڕخستنی ژیریدا.

جا یەکێك لە سەرسوڕهێنەرەکانی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ و بەهێزی تێگەیشتن و هێمنیە فراوانەکەی — لەگەڵ ئەوەی بە سروش (وحی) قسەی کردووە و ڕاستی لەسەر زار بووە- ئەوەیە کە یەکێك لە نیشانە دیارەکانی گوفتاری بریتی بووە لە گفتوگۆ واتە "وەڵامگۆیی" .

## لێزمەی گفتوگۆ:

بۆیە ئەو روبارە نەپچڕاوە لە گفتوگۆو دووبارەکردنەوەی قسە لە نێوان پەروەرگاری مەزن و تێکڕای دروستکراوەکانی دا لە مرۆڤ و پەری و فریشتە، لەگەڵ ئەوانەی ملکەچ بوون و ئەوەشی سەرپێچی کردبێت، ئەوەی باوەڕی هێنابێت و ئەوەی نکوڵی کردبێت، لە سەرەتای دروستبوونیانەوە تاکو دابەشبوونی خەڵك بۆ دوو دەستە: دەستەیەك بۆ بەهەشت

و دەستەیەك بۆ دۆزەخ، هەموو بەیانی و ئێوارەیەك لە دەرگای بیستنی پێغەمبەری خوای دەدا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە کاتی پێش نوێژی کردنی بۆ خەڵك، ڕاگەیاندنی ئەو پەیامەی پێیەتی و لە قورئان خوێندنی ناو شەونوێژە درێژەکانی دا، دوای هەموو ئەوانە چۆن گفتوگۆ بۆی نابێتە ڕەوشت و ناسنامەیەکی گشتی، بگرە گفتوگۆ بووبوو بە خووڕەوشتێکی وا کە وەك خوێن بەدەمارەکانی دا هاتووچۆی دەکرد و لەگەڵ هەناسەدانی دا ئاوێتە بووبوو .

لەبەر ئەوە ئەو قسەیەی دەڵێ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ یەکێك لە ڕەوشتەکانی بریتی بوو لە گفتوگۆکردن، قسەیەکی تەواو ڕاستە و کۆکە لەگەڵ واقیع و ڕاستیەکان و ئەو گێڕانەوە زۆرو زەبەندە سەلمێنراوانەی باس لە خۆڕازاندنەوەی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەکەن بە ڕەوشتی گفتوگۆ وەك بنەمایەك لە بنەماکانی بانگەواز، شێوازێکی بنەڕەتی لە شێوازەکانی ڕێنموونی خەڵك و پەروەردەکردنی شوێنکەوتووان و خۆشەویستان و قایلکردنی نەیاران و بڕینی بەڵگە و بیانووەکانیان و ئەو گەیاندنەی خوا لەسەری واجبکردبوو، دەسا خوایە درودو سەلامی خۆت بڕژێنە بەسەر موحەممەدی پێغەمبەری نەخوێندەوار و، خانەوادەو یارو یاوەرانی، درودێکی زۆرو بێ بڕانەوە.

## کاریگەری پەیوەستبوون بە قورئان لەسەر پێغەمبەری گفتوگۆکار ـ دروودی خوای لەسەر ـ:

پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ شەرمی نەکردووە لەوەی گفتوگۆ بکات و ڕێگر نەبووە لە وتووێژکردن هەتا لەبارەی ئەو بابەتانەی کە زۆر ورد بووبن و زۆرترین کاریگەریان هەبووبێ، هەر وەك لە بەشی سێیەم دا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، چۆن نا؟ لەکاتێکدا دەبینێ لە کتێبی مەزنی خوادا گفتوگۆ لەسەر بناغەی هەموو بنەماکان و ڕاسترینی ڕاستیەکان کراوە، پێغەمبەرانی خواش "درودو سەلامی خوایان لەسەر بێت" لەوەدا نموونەو پێشەنگێکی جوانن لە پێشێ: ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓاْ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ

إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ [إبراهيم: ١٠ - ١٢] (١)

## ئەوروپا لە کوێ بوو ئەو کاتەی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ گفتوگۆی دەکرد لەگەڵ خەڵك:

لە سەرەتای سەدەی یەکەمی کۆچی پیرۆزدا کە هاوکاتە لەگەڵ سەدەی شەشەمی زاینی، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ زۆرینەی کاتەکانی بە وتوویژو گفتوگۆ بەسەر دەبرد لە هەموو ئاستەکان دا، گفتوگۆو دەمەتەقێ و مشتومڕی دەکردو، بەڵگەو نیشانەی دەخستەڕوو لەسەر ڕاستی بانگەوازەکەی و تاك و تەنهایی پەروەردگارەکەی، ڕاستیەکانی ڕۆژی دوایی، لە بەرامبەر خەڵکی نزیك و دوور، ئازادو بەندە، دوژمن و دۆست دا، ئا لەو کاتانەدا (لە ئەوروپا) کەنیسە پەتی سێدارەی هەڵدەخست بۆ نەیارەکانی، چاوی هەڵدەکۆڵین، ئەوانەی ناکۆك بوون لەگەڵی لەخاچی دەدان و بەزیندوویی خەڵکیان دەسووتاند، بە زەبری شمشێر حوکمیان بەسەر هەموو خاوەن بیروڕایەکدا دەدا .

---

(١) إبراهيم :١٠- ١٢. واتە: جا پێغەمبەرەکانیان وتیان: ئایا گومان هەیە لە بوونی خودایەکدا کە ئافەریدگاری ئاسمانەکان و زەوییەو بانگتان ئەکات بۆ ئەوەی لە تاوانەکانتان خۆش بێ و مۆڵەتیشتان بدات بۆ ئەوەی تا ماوەیەکی دیاریکراو بژین . کافرەکان بە پێغەمبەرەکانیان وت : ئێوە لە بنیادەمێکی وەك ئێمە بەولاوە نین، ئەتانەوێ ڕێمان لەپەرستنی ئەو شتانە لێبگرن کە باوو باپیرانمان پەرستوویانن . کەواتە دەلیلێکی ئاشکرامان بۆ بێنن ئیسپاتی قسەکەتان بکات کە ڕاستگۆن . پێغەمبەرەکانیان وتیان : ئێمە لەڕاستیدا هەر ئادەمیزادێکی وەك ئێوەین، بەڵام خودای گەورە چاکە لەگەڵ کەسێکا ئەکا کە خواستی لێبێ لە بەندەکانی خۆی و پایەی پێغەمبەرایەتی ئەداتێ .بۆ ئێمە ڕەوا نیە و ناتوانین بە ئیزنی خودا نەبێ موعجیزەیەك یان ئایەتێکی دیاری بهێنین بۆ ئێوە. کەواتە ئەوانەی خاوەن ئیمانن با هەر پشت بە خودا ببەستن . ئێمە چیمان دەست ئەکەوێ ئەگەر پشت بە خوا نەبەستین کە هیدایەتی داوین بۆ ڕێگای ڕاستی خۆمان کە ڕێگای فەرمانبەرداری خودایە؟ بێگومان ئێمە خۆمان لەبەر ئازاری ئێوەدا ئەگرین، دەی با ئەوانەی پشت بە خودا ئەبەستن لەسەر ئەو پشت بەخودا بەستنەیان بەردەوام بن .

## "قُل": بڵێ:

بێگومان ئەو فەرمانە خواییەی "قُل": بڵێ کە بە پێغەمبەر ـ درووودی خوای لەسەر ـ کراوە لە قورئاندا، لە کرۆکی خۆیدا بانگەوازێکی ڕاشکاوانەیە بۆ گفتوگۆکردن، وەڵامداتەوەی خەڵك، ئەوەش لە قورئاندا زۆرە بەجۆرێك ئەگەر کۆبکرێتەوە هیچمان بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی بڵێین قورئان کتێبی گفتوگۆیە، ئەو پەیامبەرەش ـ درودی خوای لەسەر ـ کە هێناویەتی "پەیامبەری گفتوگۆکردنە" .

من خۆم بەدوای ئەو فەرمانە ناوازە خواییەدا گەڕام، فەرمانی (قُل) کە بۆ پێغەمبەر هاتووە، لە سێیەکی یەکەمی قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی فاتحەوە تاکو سورەتی التوبە، ئەو ئایەتانەم ژمارد کە تێیاندا فەرمانی قسەکردن و دواندن بە پێغەمبەر ـ درووودی خوای لەسەر ـ کراوە، بە سێ شێواز کە بریتین لە (قُل، وقُل، فقُل) بۆم دەرکەوت ژمارەیان دەگاتە سەت و دە ئایەت (١١٠ ئایەت) .

### هەروەها بۆم دەرکەوت فەرمانی خوایی (قُل) بە تەنها یان بە خستنەپاڵی پیتی (واو) و (فاء) بە شەش جۆر هاتووە:

١ـ **بۆ نزا و تکا:** لە یەك ئایەتدا هاتووە، ئەویش ئەم فەرمایشتەی خوایە: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾﴾ آل عمران: ٢٦ .[1]

٢ـ **بەربەرەکانێ و دەستەوسانکردن:** پێنج ئایەتیش لەو بارەوە هاتوون، یەکێك لەوان ئەم ئایەتەیە: ﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾﴾ البقرة: ٩٤ .[2]

---

(١) آل عمران : ٢٦.

(٢) البقرة : ٩٤.

**٣ـ هەڕەشەو ترساندن:** پازدە ئایەتی لەبارەوە هاتوون، یەکێکیان ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُ عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾﴾ الأنعام: ١٤٧ .[1]

**٤ـ وەڵامدانەوەی پرسیار و یاسادانان:** شازدە ئایەتی لەبارەوە هاتوون، لەوانە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾﴾ البقرة: ٢١٩ .[2]

**٥ـ ڕاگەیاندن و ڕوونکردنەوە:** لەو بارەشەوە بیست و حەوت ئایەت هاتوون، ئەمەش نموونەیەکی ئەو ئایەتانەیە: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا إِن يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾﴾ الأنفال: ٣٨ .[3]

**٦ـ فەرمانکردن بە گفتوگۆ و دەمەتەقێ:** ئەوەش لە چل و شەش ئایەتدا هاتووە، وەك ئەم فەرمایشتەی خوای بەرزو بالا: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾﴾ الأنعام: ٩١ .[4]

---

(١) الأنعام : ١٤٧.

(٢) البقرة : ٢١٩.

(٣) الأنفال : ٣٨.

(٤) الأنعام : ٩١.

## مەزنترین کاریگەر لەسەر کەسایەتی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر:

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ پێغەمبەر ـ درووودی خوای لەسەر ـ کە بەهێزترین کاریگەری قورئانی لەسەر بووە، وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاری بەرزو پیرۆزی داوەتەوە لە ئەنجامدانی گفتوگۆو گرێدانی کۆڕی دەمەتەقێ و مشتومڕ بەشێوازی جوان، لەمەدا وەڵام دەرەوەی فەرمانی خوا و هەڵگری ڕەوشتەکانی قورئانی پیرۆزو ئەو هیدایەت و داناییە بووە کە لە قورئان دا هاتووە.





## دووەم:

## باسە سەرەکیەکانی ئەم کتێبە:

# مواریەکانی گفتوگۆ لە ژیاننامەی پێغەمبەری هەڵبژێردراودا ﷺ

## گفتوگۆ بۆچی؟:

بێگومان دوو دانه له ڕەوشته هەره بەهێزەکان و ئاکاره هەره چەسپاوەکانی هەموو مرۆڤێك بریتین له بیروباوەڕو بنەما (پرەنسیپ)ەکان (العقائد والمبادئ). ژیان خۆش نابێت و جیهان باش نابێت بەبێ ئەو دووانه. ئەو دووانه بناغەی هەموو بەرژەوەندیەکی شکۆدارو چاوگەی هەموو ڕەوشتێکی ڕەسەنن، سوودی مرۆڤێك چیه که بێباوەڕ بێت بەخوای تاك و تەنهاو، نکوڵی له بوونی دروستکەرو بەدیهێنەرو ڕۆژی دەری خۆی بکات ! سودی ئەو مرۆڤه چیه که ڕێزی هیچ ئاینێك نەگرێت و دان به هیچ ڕەوشتێك دا نەنێت و پابەندی هیچ بەهایەکی بەرز نەبێت ! ئەو دوو جۆره کەسه چ ژیانێك دەژین و چ جۆره زیندوێکن؟!

لەبەر ئەوه بیروباوەڕه ڕاستەکان و بنەما ڕەسەنەکان بناغەی ژیانێکی ئاسوودەو گوزەرانێکی بەختەوەرانەن، هەروەها ڕێگای هەموو بەردەوامبوونێك و خۆری هەموو چاکەیەك و پاڵپشتی هەموو کارێکی باشن .

بیروباوەڕه ڕاستەکان بنچینەی هەموو بانگەوازەکان و ئامانجی مەزنی هەموو پێغەمبەران و چاکەخوازان بووە: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ۝٥٩﴾ الأعراف: ٥٩ .[1]

ئەمه لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران و نێرراوانی خوا ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت ـ دووباره بۆتەوەو، گووتاری دەسپێکی بانگەوازەکانیان بووه و وتەی سەرەکی چاکسازیەکانیان بووه .

بنەما ڕەسەنەکانیش دەرەنجامی دروستی بەردەوامبوون لەسەر بیروباوەڕو ڕۆچوونی ئیمانن، ئیمانی نیه ئەو کەسەی ئەمانەتی نەبێ، هەروەها دینی نیه ئەو کەسەی ڕەوشتی نەبێ، دین و ڕەوشت دوانەیەکن لەیەك دانابڕێن، بەیەکەوه لکاون لەیەکتر جیا نابنەوە، هەرکات مرۆڤ دینی هەبوو ڕەوشتیشی دەبێ، بەڵگەی ئەمەش ئەو فەرموودەیەیه که ئەنەس ـ خوا

---

(١) الأعراف : ٥٩. واته: قەومینه خودا بپەرستن بێجگه لەو خودایەکی ترتان نیه . بەراستی من ئەترسم لێتان ئەگەر ئیمان به خودا نەهێنن و نەیپەرستن تووشی سزاو ئازاری ڕۆژێکی گەوره ببن .

لێی ڕازی بێت ـ گێڕاویەوە، دەفەرموێ: (خطبنا رسول الله ﷺ فقال في الخطبة: لَا إِيَمَانَ لِمَنْ لَا أَمَانَةَ لَهُ وَلَا دِينَ لِمَنْ لَا عَهْدَ لَهُ)[1].

واتە: پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ وتاری بۆدابن، لە وتارەکەی دا فەرمووی: ئیمانی نیە ئەو کەسەی ئەمانەت پارێز نەبێت، ئەو کەسەش دینی نیە کە پەیمانی لەلا نەبێت نەیباتە سەر .

دیارە خەڵکیش کانزان وەك کانزای زێڕو زیو، جا ڕوونی و جوانی کانزای مرۆڤی پاك و، درەوشانەوەی زەردەخەنە جوانەکانی و ڕەونەقی ڕەوشتە ڕەسەنەکانی بەڵگەی ئەو چاکەیەیە کە لە ناخی دا هەیە و ئەو دینەیە کە پێیەتی، هەر لەبارەی ئەو مانایەشەوە پێغەمبەرمان ـ درودی خوای لەسەر ـ دەفەرموێ: (أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا، وخيركم خيركم لنسائهم)[2].

واتە: تێروتەواترینی باوەڕداران لە ڕووی ئیمانەوە ئەوانەن کە ڕەوشتیان لەوانی تر جوانترە، وەباشترینیشتان ئەوانەن کە باشترینن بۆ ئافرەتەکانیان.

## هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ قووڵکردنەوەی بیروباوەڕی ڕاست و ڕەوشتی بەرز جگە لە گفتوگۆ:

چونکە ئەو ڕەفتارانەی مرۆڤ کە لە قەناعەتی چەسپاوی ناو دڵ و دەروون سەرچاوە دەگرن، دەبن بە ڕەفتاری بەردەوام و هەمیشەیی، هیچ ڕێگایەکیش نیە بۆ دروستکردنی قەناعەت و قووڵکردنەوەی ڕەوشت و بەها و بنەماکان جگە لە گفتوگۆی نەرم و هێمنانەو هاوسەنگ، کە ڕەچاوی سروشتی دەروونی مرۆڤ و ئاکارە خۆڕسکە مرۆییەکان، جیاوازی تێگەیشتن و پەی پێبردنی نێوان خەڵك و ئاڵوگۆڕی دۆخی دەروونی و میزاجیان بکات .

(١) اخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب الإيمان – باب فرض الإيمان برقم: ١٩٤ .

(٢) أخرجه الترمذي في سننه في أبواب الجنائز – باب ما جاء في حق المرأة عن أبي هريرة رضي الله عنه، برقم ١١٣٦ وقال : هذا حديث حسن صحيح .

مرۆڤ بە سروشتی خۆی ناتوانێ بە گۆشەگیری و بەبێ بوونی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا ژیان بکات، لەکاتی بوونی پەیوەندیش لەگەڵ خەڵك هەندێکجار ڕێککەوتن و هەندێك جاریش جیاوازی و ڕاجیایی دێتە ئاراوە: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ۝١١٨﴾ هود: ١١٨ .[1]

ئەمەو بێگومان مەزنترین و بەرزترین بنچینەی گفتوگۆ بریتیە لە گوێگرتنی قووڵ و ڕاستگۆیانە کە دەرفەتی تەواو بە بەرامبەر دەدات بۆ دەربڕینی ڕای خۆی و خستنە ڕووی قسەی دڵی، لە کەشێکی ئارام و هێمندا، ئەگەر تەنانەت ئەو قسانەی لەدڵیدان نامۆو ڕیزپەڕیش بن، چونکە بێگومان درکاندنی تێروتەواو ڕێگایەکە بۆ زانینی شوێنی کەم و کوڕیەکان بە ڕوونی و تەواوی، لەمەوە گفتوگۆ دەچێتە سەر ڕەگوڕیشەی کێشەکان و بنچینەی لادانەکان، بۆ ئەوەی لە گفتوگۆدا ڕۆشنکردنەوەی پێویست و چارەسەری شیفابەخشمان دەس بکەوێت کە ببێتە مایەی قایلبوون، لە سایەیدا دیدگای ڕاست و ڕۆشن جێگای ئارەزووە نامۆکان و ڕاوبۆچوونە ڕیزپەڕەکان بگرێتەوە .

بەرهەمی ئەوەش کۆمەڵێك قەناعەتی ڕاست و ڕۆچوو دەبێت لە دەروونی مرۆڤدا، ئەویش بەرجەستە نابێت تەنها لە ڕەفتارێکی دروست و پێگەیشتوودا نەبێت .

گفتوگۆ لۆجیکی کەسانی ژیرو نەریتی دانایانە، بەرزترین شانازی ئادەمییەکانە لە بواری بەیەك گەیشتندا، پێشکەوتووترین پرۆگرامی رۆشنبیری و فێرکردنە .

گفتوگۆ وەکو نەخش وایە، لە دڵ و دەروونەکاندا ڕەگ دادەکوتێ، شوێنەواری هەمیشەیی دەبێ بەسەر هەڵسوکەوتەوە، وا لە مرۆڤ دەکات گوێگرێکی باش بێت، قبوڵی هەمەجۆری بکات، کە ئەوە سروشتی مرۆڤە، هەروەها وا لە مرۆڤ دەکات سەیری وێنە گەورەو تەواوەکە

---

[1] هود : ١١٨، واتە: ئەگەر خودای تۆ مەیلی ببوایە بەرەی بنیادەمی هەموو نەکردە یەك ئوممەت و هەموو موسڵمان نەبوون . ئەم بەرەی بنیادەمە بەردەوام ناجۆرو لەیەك جیان، هەندێکیان ئیماندار و هەندێکیان بێ ئیمانن

بکات، کاتێك مەسەلەکە لە هەموو گۆشەکانیەوە دەبینێت، ئەمەش بە یارمەتی خواستن لە برایانی و هاوشانەکانی .

کێ هەیە لە خەڵکی پێویستی بە ڕای کەسانی تر نەبێت ! لەکاتێکدا مەزنترینی خەڵکی و کامڵترینیان لە ڕووی ژیری و بیروڕاوە، گوێی بۆ خۆشەویستانی دەگرت، بەدەم ڕای لاوازو بچووکەکانەوە دەچوو پێش بەهێزو گەورەکان، ئەگەر قازانجێکی تێدا دیتبا یان چاکەیەکی تێدا بەدی کردبا)[1].

## گفتوگۆ لە ژیاننامەی پێغەمبەر موحەمەد دا ـ دروودی خوای لەسەر ـ :

لە قورئانی پیرۆزدا خوای مەزن پێغەمبەرەکەی ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەدوێنێ و فەرمانی پێدەکات و ڕێنمایی دەداتێ سەبارەت بە گرنگی گفتوگۆ وەك یەکێك لە بەهێزترین ڕێگاکان و کاریگەرترینیان لە ئەنجام دانی ئامۆژگاری و بنیاتنانی بانگەواز، ئەو ئاراستەکردنەشی هاوتاکردووە بە ئامۆژگاریەکی گرنگ کە بە بنچینەی سەرەکی هەر گفتوگۆیەك دادەنرێ: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾ النحل: ١٢٥ .[2]

پێغەمبەریش باشترین وەڵامدەرەوەی ئەم بانگەوازە بوو زۆر بەباشی ئەو ئامۆژگاریەی جێبەجێ کرد، چونکە هیچ گفتوگۆیەك دروست نابێ، هیچ مشتومڕێکیش پەسەند ناکرێ ئەگەر بە ئاورێشمی ئەدەب دانەپۆشرێ و بە دەزووی حیکمەت نەپێچرێتەوە .

---

(١) بڕوانە کتێبی: أسرار القيادە والتأثير، نووسەر: أ.سليمان بن عوض قيمان ، لاپەڕە: ١٠١-١٠٢ .

(٢) النحل: ١٢٥ . واتە: خەڵك بانگ بکە بۆ ڕێگای خوداو بۆ ئیسلامبوون بەشێوەیە کە موافیقی ئەقل و هۆشی ساغ بێ، هەروەها بە پەندو ئامۆژگارییەك کە جوان بێ و دڵیان نەرم بکات، ئەگەر شوێنەکەیش شوێنی مشتومڕ بوو کە بەرانبەر ئەیەوێ قسەی خۆی بباتە سەر، ئەوە پێویستە بەباشترین شێوە قسەی لەگەڵ بکەی.

## هەشت چەشنی گفتوگۆی پێغەمبەر:

گفتوگۆکانی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - هەمەچەشن بوون بەجۆرێك كە هەموو هەڵسوکەوتەکانی گرتۆتەوەو هەموو ئەو مرۆڤانەشی گرتۆتەوە كە مامەڵەی لەگەڵ كردوون، ئەگەر سەرنج بدەی و چاوبگێڕی دەبینی گفتوگۆی لەگەڵ دۆستان و لەگەڵ نەیارانی دا كردووە، گفتوگۆی لەگەڵ هاوبەش پەرستان و لەگەڵ خاوەن كتێبەكان كردووە لە جولەكە و گاور، گوێی بۆگرتوون و وەڵامی پرسیارەكانیانی داونەتەوە، گفتوگۆی لەگەڵ دوژمنەكانی كردووەو پەیمانی لەگەڵ هەندێكیان بەستووە، تەنانەت گفتوگۆی لەگەڵ ئەو پیاوكوژانەش دا كردووە كە هەوڵیان داوەو بیكوژن و خوێنی پاكی بڕێژن، ئنجا لە گفتوگۆی لەگەڵ خاوخێزانی و هاوەڵانی بە پیرو بەتەمەن و گەنج و منداڵەوە هەر مەپرسە، لەو ڕووەوە "پێغەمبەری وتووێژكار" - دروودی خوای لەسەر - شتی ئەوەندە سەرسوڕهێنەری هەبووە، لە سەرگوزشتەی هیچ پێغەمبەرێك و هیچ هەڵكەوتوویەك دا وێنەی نیە، جا من نموونەكانی گفتوگۆم لە ژیانی پێغەمبەردا - دروودی خوای لەسەر - دابەشكردوە بەسەر هەشت بەند دا، هەروەك دوای چەند لاپەڕەیەكی كەم ڕوون دەبێتەوە .

لەبەر گرنگی ئەو نموونانەی گفتوگۆكردن، پایەخێكی تایبەتم پێداون و بەشی هەرەزۆری گرنكیدانم بەوان بووە، چونكە ئەو نموونانە ناوەرۆكی لێكۆڵینەوەكەو كرۆكەكەیەتی، هەر باسێكی ئەو بەندەم دابەش كردوە بەسەر سێ (خواست: مطلب) دا:

## خواستی یەكەم: ڕێخۆشكردن و زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

مەبەستم لەوە هاتنەدی سێ شتە یان هەندێك لەو سێ شتە:

١- پێویستە هەر كام لە لایەنە گفتوگۆكارەكان خاوەن كەسێتی مەعنەوی و قەوارەی دیاریكراوی خۆیان بن، بەرامبەرەكەیان دانیان پێدابنێ و ڕێزیان بۆ دابنێت و دان بە چاكەكانیان یان هەندێك لەچاكەكانیاندا بنێت .

٢- دەبێ هەر كام لە گفتوگۆكارەكان خاوەن تێڕوانینی خۆی بێت و باوەڕی بە ڕاستێتی و حەقتربوونی هەبێت، بەڵگە و پاڵپشتی هەبێت بۆ بەرگریكردن لێی .

٣ـ دەبێ هەر یەك لە گفتوگۆکاران ئامانجێکی هەبێت کە هەوڵ بدات بۆ بەدیهێنانی، مەبەستێکی هەبێت و بۆی بگەڕێ لە میانەی گفتوگۆکردنی لەگەڵ لایەنی بەرامبەردا.

## خواستی دووەم: چەند نمونەیەك لە گفتوگۆ

سەرەتا بە نموونەیەك دەستم پێکردوە و شیکردنەوەو وردەکاریەکانم باس کردوە پاشان بەدوایدا چەند نموونەیەکم هێناوەتەوە وەك جەختکردنەوە لەسەری، کە بریتین لە کۆمەڵێك نموونەی یەك لەدوای یەك کە ئەو بەیەکەوە بوون و ئەنجامدانی گفتوگۆیە دەردەخەن، لە شوێنی جیاوازو کاتی جیاوازدا، لەبارەی کۆمەڵێك مەسەلە، بەجۆرێك کە تەنها قسەیەکی زارەکی و هەڵوێستێکی تاکە کەسی نەبێت لە چەند بارودۆخێکی دیاریکراودا، چونکە ناکرێ هەڵوێستی تاك وەك ڕێچکەیەکی دواندن و نموونەی بەیەکەوە گفتوگۆکردنی دوو لایەن ئەژمار بکرێت، هەر بەندێکیشم بە گەوهەرێك لە گەوهەرەکانی گفتوگۆ کۆتایی پێهێناوە لەگەڵ ئەو دەستەیەداو، ناوم ناوە "مرواری درەوشاوە" کە بەهێزترین نموونەو، ڕاستترین بەلگەی تێدایە لەسەر ڕەوشتی گفتوگۆ لە پێغەمبەردا ـ دروودی خوای لەسەر ـ.

## خواستی سێیەم: پوختەی باسەکەیە، مەبەستم پێی:

ئەو پوختەیەیە کە خوێنەر هەڵی دەگۆزێت لە کۆی ئەو نموونە گفتوگۆییانەی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هەر دەستەیەك لەو هەشت دەستەیە، کامانەن ئەو بنەما و پلانانەی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ پشتی پێ بەستوون لەگەڵ هەر تاقمێك دا بۆ بەدەستهێنانی باشترین ئەنجام و بۆ ئەوەی ئەو پلانانە ببنە ڕێبازو سەرمەشقێکی جوان بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ بچێتە ناو پرۆسەیەکی گفتوگۆکاریەوەو، لە دڵیدا کۆمەڵێك بۆچوون و ئامانج هەبن کار بکات بۆ بەدیهێنانیان لە ڕێگەی پرۆسەی گفتوگۆوە، ئایا تا چ ئاستێك پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ ئامانجەکەی خۆی هێنایەدی و گەیشت بە خواستی خۆی لەڕێی گفتوگۆو دواندن و کارلێکی ئەرێنی لەگەڵ خەڵکی تردا؟



**نمونەکانی گفتوگۆشم بەپێی**

**بابەتەکانیان دابەش کردوە بەسەر هەشت باس دا:**

باسی یەکەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوبەشدانەران (المشركين).**

باسی دووەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خاوەن کتێبەکان (جولەکەو گاورەکان).**

باسی سێیەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ گەلانی خاوەن شارستانیەت و ئازاددا.**

باسی چوارەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ بکوژو پیلانگێراندا.**

باسی پێنجەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵان.**

باسی شەشەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ گەنجان و هەرزەکاراندا.**

باسی حەوتەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوسەرەکانی و ئەندامانی خێزانەکەی.**

باسی هەشتەم: **گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ فریشتە بەڕێزەکاندا.**



## بەشی دووەم

# گفتوگۆ لە ژیاننامەی پێغەمبەری هەڵبژێردراودا ﷺ

# گفتوگۆ بۆچی؟

## باسی یەکەم

# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوبەشدانەران



بێگومان سەرانی هاوبەش پەرستی لە مەککە دەیانزانی کە پێغەمبەر ﷺ حەقی پێیە، دەشیانزانی ڕاستگۆترین کەسە، ئەوەی ڕێگەی لێ گرتبوون ملیان بۆ حەق کەچ بکەن و بەگەڵ کاروانەکەی بکەون خۆبەزلزانی و دەستگرتن بە پلەوپایە و بیرکردنەوە و ڕای سەقەت بوو وایکرد بکەونە بەرەی دژایەتی پێغەمبەر ﷺ و بانگەوازەکەی.



## خواستی یەکەم
# ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ

## ڕێخۆشکردن:

پێغەمبەر موحەمەد ـ دروودی خوای لەسەر ـ کەسێکی نامۆ نەبوو لەلای خەڵکی مەککە، ئەوان کەسوکارو هۆزی خۆی بوون و لەناو ئەواندا پێگەیشتو ژیانی ئەوانی دەدیت، ئەوانیش (محمد) یان تاقیکردبۆوە لەوکاتەی منداڵێکی بێباوکبوو، دواتر خستبوویانە ژێر سەرنجی خۆیان ئەوکاتەی گەنجێکی هەڵکەوتووبوو، زیاتریش چاویانخستبووە سەری ئەوکاتەی بووبوو بە پیاوێکی پێگەیشتووی سەنگین، جا کە ڕاستگۆیی و دەستپاکی ئەویان بۆ دەرکەوت سیفەتێکی جوان و نازناوێکی بەرزیان بۆ دانا.

## دەستپاکەکە هات:

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ـ خوا لێی رازی بێت ـ لە چیرۆکی بنیاتنانەوەی کەعبەدا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (کاتێك پێغەمبەریان دیت ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە دەرگاوە هاتە ژوورێ، گوتیان: ئەوە دەستپاکەکە هات)[1] .

## دەستپاکەکە درۆی لێنەبینراوە

خەڵکی مەککە کەسوکارو خزمی پێغەمبەر بوون ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەیان ستەم و خراپە کردبوو بەرامبەری کە خەڵکی ئاسایی بەرگەیان نەدەگرت و جاری وا هەبوو هاوەڵانی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەهاتنە خزمەتی لەکاتێکدا ئەو لە سێبەری کەعبەدا سەری بە پاڵتۆکەیدا کردبوو، ئەوانیش شوێنەواری لێدان و خەمناکی ئەشکەنجەدان بە روخسارەیانەوە دیاربوو، چونکە ئازاردرابوون، دەیانگوت ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی و دوعامان بۆ ناکەی؟! ئەویش پێی دەفەرموون: پیاوی وا هەبووە لە پێش ئێوە چاڵی بۆ هەڵدەکەنراو مشار دەخرایە سەرسەری و دەکرا بە دوو

---

(١) أخرجه الطبراني في المعجم الأوسط ـ باب الألف برقم ٢٤٩٦.

کەرتەوە واش لە دینەکەی پاشگەز نەدەبۆوە، سوێند بەخوا خوا ئەم دینە دەگەیەنێتە ئەنجام هەتا وای لێدێت سوارێك لە سەنعاوە سواردەبێت بۆ حەزرەمەوت ترسی لە هیچ شتێك نابێت جگە لە خوا یان ترسی ئەوەی گورگ پەلاماری مەڕەکانی بدات، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن [1].

## سێزدەساڵ گفتوگۆ:

لەوانەیە بپرسی پێغەمبەر موحەمەد - دروودی خوای لەسەر - سێزدە ساڵی لە مەککە بردەسەر، هیچ رووبەرووبونەوەیەکی نەکرد، رمێکی هەڵنەگرت و شمشێری هەڵنەکێشا، ئەدی چی دەکرد لەو هەموو ماوەیەدا؟ لەڕاستیدا پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - گفتوگۆی لەگەڵ خەڵکی مەککە و دەوروبەریدا دەکرد بۆ ماوەی سێزدە ساڵی رەبەق لە هەموو رۆژەکانیدا، لە هەموو شەوەکانیدا، ماندوونەدەبوو، دوودڵ نەبوو، لاری نەبوو لە گوێگرتن لە قسەکانیان و وەڵامدانەوەیان و ئارامگرتن لەسەر ئازاردانەکانیان کە بە زمان گاڵتەیان پێدەکرد و بە دەم سوکایەتیان پێدەکرد، بە دەست و هێزیش ئازاریان دەدا .

## دەستپێکی بانگەوازی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - گفتوگۆی راشکاو بوو:

هەرلەو کاتەوە کە پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - لەسەر کێوی (صفا) بانگەوازەکەی راگەیاند، پرۆژەی گفتوگۆیەکی درێژ و مشتومرێکی کراوەی خستەڕێ، تەنانەت پێش ئەوەی بانگیشیان بکات بۆ وەرگرتنی دینەکەی و رازی بوون بە مەنهەجەکەی، گفتوگۆی لەگەڵ ئەنجامدان وەك پێشەکیەك بۆ بانگەوازەکەی و رێگایەك بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو راستیەی لەلایەتی، وەڵامەکەی ئەوانیشی کردە بەشێك لە گوتاری بانگەوازی خۆی و بەرپەرچدانەوەی ئەوان، کردی بە بەڵگەیەك لەسەر ئەو حەقەی هێناویەتی .

---

(١)أخرجه البخاري في كتاب المناقب – باب عامات النبوة في الاسلام برقم: ٣٤٤٢ عن خباب بن الأرت رضي الله عنه.

## سوپایەك لە قەدپاڵی چیاکەوە دێت:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت دەفەرموێت: (کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ الشعراء: ٢١٤ ) واتە: خزم و کەسە نزیکەکانت ئاگادار بکەوە، کەسە دلسۆزەکانت بەتایبەت . پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ چووە دەرەوەو سەرکەوت بۆ سەر (صفا) بانگیکرد (یا صباحاه) خەلك گووتیان: ئەوە کێیە؟ جا لێی کۆبوونەوە، ئەویش فەرمووی: ئایا ئەگەر پێتان بڵێم کۆمەڵە سوارێك لە دامێنی ئەو چیایەوە دێن بۆ سەرتان باوەڕم پێدەکەن؟ گوتیان درۆمان لە تۆ نەدیوە، پێغەمبەریش فەرمووی: دەی من ئاگادارکەرەوەی ئێوەم پێش گەیشتنی سزایەکی زۆر توند، ئەبولەهەب گوتی: دەك لەناوچیت، هەربۆ ئەوە کۆتکردینەوە؟ ئینجا هەستا، جا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾﴾ المسد: ١ . واتە: لەناوچوون بۆ ئەبولەهەب و لەناویشچوو.

## سیحری گفتوگۆ:

هاوبەشپەرستەکان بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن کەوتبونە ناو پرۆسەی گفتوگۆوە، بەرەو رووی کێشکراەوون بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن، ئەوان لە ژێر کاریگەریی سیحر و جوانی و درەوشانەوەی ئەو گفتوگۆیانەدا بوون، ئەگەرچی پێغەمبەریشیان ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە کەم ئەقڵ ناودەبرد و ڕێگەیان لێدەگرت لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەقەی پێیبوو، هاوەڵەکانیشیان ئەشکەنجە دەداو هەندێکیشیان دەکوشتن، هەروەها ئەزیەتی خۆی و ماڵ و منداڵیان دەدا، رەتیشیانکردەوە گوێی لێبگرن و وتوێژی لەگەڵ بکەن، ئەوان هەستیانکردبێ یان نەکردبێ، دەستەوسان بوون لە وەستاندنی بانگەواز، هەروەها شکستیان هێنا لە بەرەنگاربوونەوەی ڕووناکی ئەو نورەی کە خودا دایگیرساندبوو پێغەمبەریش ـ درودی خوای لەسەر ـ هەڵیگرتبوو . ئەوان لە دەرەوە بەئاشکرا سوکایەتیان بە بانگەوازەکەی دەکرد و گاڵتەیان بەو قورئانە دەکرد کە دەیخوێندەوە و بە بیروباوەڕەکەی پێدەکەنین، بەڵام لەڕاستیدا ئەوان کەوتبونە ناو گفتوگۆیەکی ناڕاستەوخۆ و بە گاڵتەپێکردن ئەوان وەڵامی قسەکانیان دەدایەوە و گومانیان دروست دەکرد لەڕاستی بیروباوەڕەکانی و بە پێیزانینی خۆیان وەڵامی پرسیارەکانی ئەویان دەدایەوە، ئەوەش لە گفتوگۆیەکی درێژدا

بەدرێژایی تەمەنی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - ، بەڵام گفتوگۆی ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - گفتوگۆی دوو هاوتا و مشتومڕی کۆمەڵێك هاونشین نەبوو، دوو روانینی ناکۆکبوو بەرامبەر بە گەردوون و ژیان بەگشتی، بیری ئیسلام و بیروباوەڕی یەکتاپەرستی کە بەستراوەتەوە بە ئاسمان وەك ئاوەڕۆك، لەسەر زەویش ڕەگیداکوتاوە وەك بیرێکی تۆکمە کە وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەداتەوە بەشێوەیەکی بابەتیانە و بەڵگەی ئەقڵی و گەردوونی دەهێنێتەوە لەسەر راستی بیروباوەڕەکانی و دروستی بیروبۆچوونەکانی.

لەبەرامبەریشدا بیری نەفامی ساویلکە، کە مەیلی بەلای شوێنکەوتنی کۆنەی بە میراتگیراودایە بەبێ تێڕامان و بیرکردنەوە لە کرۆك و ماناکانی، بەڵگەیان بۆ ئەوە تەنها بیروباوەڕی باب و باپیرانیان و مانەوەیانە لەسەری: ﴿بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الزخرف: ٢٢ - ٢٣ .[1]

سەرکۆنەی هەر شتێکی تازەو داهێنراویان دەکرد بە گومانی خۆیان و دەیان گووت: ﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾﴾ ص: ٧ .[2]

ئەوەش لە ڕاستیدا بنچینەیەکی چەسپاوو باوەڕێکی ڕەگ داکوتراوو وتەیەکی دێرینە لەم سەر زەویەدا بە ئەندازەی دێرینی مرۆڤ خۆی: ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ

---

(١) الزخرف ٢٢- ٢٣. واتە: ئەوان ئەڵێن: باوك و باپیری خۆمانمان لەسەر ئەم ئاینی بتپەرستییە دیوەو ئێمە لەسەر شوێن پێی ئەوان ڕێی خۆمان ئەدۆزینەوە . هەر بەم جۆرە ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لە هیچ ئاوەدانییەکا ئادەمیزاد بترسێنێ لە خوا، ئیللا دەست ڕۆشتووەکانی ئەو ئاوەدانییە بەو پێغەمبەرەیان وتووە: ئێمە باوك و باپیرەی خۆمانمان لەسەر ئاینێ دیوە و ئێمە بەشوێن پێی ئەوانا ئەڕۆین و چاولێکەرییان ئەکەین.

(٢) ص : ٧. واتە: شتی وامان لە ئاینی چەرخ و زەمانی پێش خۆمانا نەبیستووە . ئەمە لە ساختەو دەست هەڵبەست بەولاوە نیە.

ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ الحج: ٧٨ [١]. ئیبراهیم ناوی ئێوەی ناوە موسڵمان بەر لەوەی قورئان ئەم ناوەتان لێبنێ.

ئەوە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی ڕاستەقینەیە، ئەو باوەڕەی کە جوانیەکەی کاڵ بووبوویەوە و ڕوناکیەکەی خامۆش بووبوو، ناوی ون بووبوو، شوێنەوارێشی سڕابۆوە لەناو شەپۆلی دەریای بتپەرستیدا، بۆ ئەو بەدبەختە بتپەرستانە هیچ پەناگەیەك نەمابووەوە .

## ئەوە بە ڕاستی شتێکی سەیرە:

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت دەفەرموێ: (ئەبوتالیب نەخۆش کەوت، قوڕەیشیەکان هاتنە لای، پێغەمبەریش ـ درودی خوای لەسەر ـ هات بۆ لای بۆ هەواڵپرسینی، لە نزیك سەری ئەبوتالیبەوە جێگەی دانیشتنی نەفەرێك هەبوو، ئەبوجەهل چوو لەوێ دانیشت، شکایەتیان لە پێغەمبەری خوا کرد ـ درودی خوای لەسەر ـ لەلای ئەبوتالیب، گوتیان: برازاکەت قسە بەخواکانمان ئەڵێ، گووتی: ئەی برازاکەم چیت داوە بەسەر خواکانیانەوە؟ فەرموی: مامە من داوای یەك وشەم لێکردوون کە بەو وشەیە عەرەب ملکەچیان دەبێت و عەجەمیش سەرانەیان ئەداتێ، گوتی: کامەیە؟ فەرموی: لا اله الا الله، لەگەڵ ئەوەدا قوڕەیشیەکان هەستان و گوتیان: ئایا هەموو خواکانی کردۆتەوە بە یەك خوا؟ ئیبن عەباس دەڵێ: دوای ئەوە ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١﴾ ص: ١ .[٢] تا دەگاتە ئەو شوێنەی خوا دەفەرموێ: ﴿صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ١ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ٢ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ٣ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ٤ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥﴾ ص: ١ - ٥ واتە: هەموو خواکانی کردووە بە یەك خوا ؟ بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە !

---

(١) الحج : ٧٨. واتە: ئەم ئاینی خوا بەیەك زانینە ئاینی ئیبراهیمی باوکتانە (کە باوکە گەورەی پێغەمبەری خۆتانەو وەك باوکە گەورەی خۆتان وایە).

(٢) ص: ١. واتە: (ص) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم پیتە چیە . سوێند ئەخۆم بە قورئانێك کە مایەی یادکردنەوەی خوایە.

## دینیان لەو شوێنەوە سەرخست کە ئەیانویست بیڕوخێنن:

بێگومان سەرانی هاوبەش پەرستی لە مەککە دەیانزانی کە پێغەمبەر (محمد) ـ درودی خوای لەسەر ـ حەقی پێیە، دەشیانزانی ڕاستگۆترین کەسە، ئەوەی ڕێگەی لێ گرتبوون ملیان بۆ حەق کەچ بکەن و بەگەڵ کاروانەکەی بکەون خۆبە زلزانی و دەستگرتن بە پلەوپایە و بیرکردنەوە و ڕای سەقەت بوو وایکرد بکەونە بەرەی دژایەتی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ و بانگەوازەکەی، ئنجا لەگەڵ ئەوەی بە ئاشکرا قسەو بۆچوونەکانی ئەویان بە سووك سەیر دەکردو گاڵتەیان بە بانگەوازەکەی دەکرد، بەڵام بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە هاوبەشپەرستانی مەککە لەوانە دەژمێررێن کە زۆرترین گفتوگۆیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ ئەنجام داوە، لە ڕاستی دا بەم کارەی هاوبەشپەرستانی مەککە بێ ئەوەی بیانەوێ و هەست بکەن وێنەیەکی شارستانیانەی ئیسلامیان خستە ڕوو لەگەڵ ئەو دیمەنە گفتوگۆییانەی کە ئاینی ئیسلام و وەحی قورئانی و پێغەمبەر محمد ـ درودی خوای لەسەر ـ بەرجەستەیان کرد .

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

قورەیش ڕێزی تەواویان بۆ پێغەمبەر موحەمەد ـ درودی خوای لەسەر ـ دادەنا لەو کاتەوە کە وەك بازرگانێکی دەستپاك و گەنجێکی داوێنپاك ناسیبوویان کە خۆی دوور دەگرت لە هەموو ئەو شتانەی هاوتەمەنەکانی کەوتبوونە ناوی لە خراپەکاری، مەیخۆری، گوێگرتن لە گۆرانی، پەرستنی بتەکان و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، بۆیە تەنها بەناوی (الأمین) ناویان دەبرد.

## لە دیمەنەکانی بەگەورە روانینیان بۆ پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - و داننانیان بە رێزوپایەی ئەودا دوو دیمەن دەخەمە ڕوو:

**یەکەم: دیاریکردنی وەك دادوەر لە مەسەلەیەکی زۆر ترسناك و لەهەمان کات لەوپەڕی گەورەیی و پایەبەرزی دا** ئەویش مەسەلەی بنیات نانەوەی کەعبە بوو کاتێك ناکۆکی کەوتە نێوانیان و خەریکبو ببن بەشەڕیان، وەك سەرچاوەکانی سیرە دەیگێڕنەوە عەبدوڵلای کوری سائیب گوتی: (لەنێوان خۆتان رێك کەون لەسەر یەکەم پیاو کە لە دەرگاوە دێتە ژوور با ئەو نێوەندگیریتان بکات، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - هاتە ژوور، گووتیان: ئەوە دەستپاکەکەیە، چونکە ئەوان لە سەردەمی نەفامی دا بە (الامین) ناویان دەبرد، گووتیان: ئەی محمد ئێمە بە تۆ ڕازین نێوەندگیریمان بکەی، ئەویش داوای کرد پارچە قوماشێکیان هێنا، ڕایخست و بەردەکەی خستە سەر، پاشان بەم تیرەو بەو تیرەی گوت وەرن- ناوی هەندێکیان هێنا- فەرمووی هەر یەکەتان چمکێکی پارچەکە بگرن، ئەوانیش هاتن و بەیەکەوە بەرزیان کردەوە ئنجا پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - هەڵیگرت و بەدەستی خۆی داینا﴾[1].

**دووەم: دانانی پارەو سپاردەکانیان لەلای پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر -** یەکێك لەو بەڵگانەی ئەوە دەسەلمێنن ئەوەبوو پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - عەلی کوڕی ئەبوتالیبی لەجێی خۆی بەجێهێشت لە مەککە بۆ ئەوەی سپاردەکانی خەڵکی بگێڕێتەوە، عورو‌ەی کوڕی زوبێر لە خاتوو عائیشە - خوا لێی ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە سەبارەت بە کۆچی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - و دەڵێ: ( پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرمانی بە عەلی کرد - خوا لێی ڕازی بێت -

---

(١) أخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب الصوم برقم: ١٦٣٤، وقال: هذا حديث صحيح على شرط مسلم ولم يخرجاه وله شاهد صحيح على شرطه .

لە مەککە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لەجیاتی پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - ئەو ئەمانەتانە بداتەوە خەڵکی کە لای دانرابوون)[1].

جا وەك چۆن قورەیش پێغەمبەریان - درودی خوای لەسەر - لەلا گەورە بوو ڕێزیان دەگرت پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر، پێغەمبەریش - درودی خوای لەسەر - زۆر لە خەمی هیدایەتدانی قەومەکەی دا بوو، حەزی دەکرد رزگاریان بکات و بەرژەوەندی ئەوانی دەویست، یەکێك لەو شتانەی ئەو بەخەمەوە بوونە زۆرەمان بۆ دەردەخات ئەومیە خوای مەزن لە سێ شوێنی قورئاندا ئاماژە بەو خەمخواردنەی پێغەمبەرەکەی کردوە - درودی خوای لەسەر - داوای لێکردوە خۆی بپارێزێ و ئاگای لەخۆی بێت، چونکە خەمخواردنی زۆری پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - نزیك بوو زیانی پێ بگەیەنێ و بیفەوتێنێ:

١- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾﴾ فاطر: ٨ .[2]

٢ - خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾﴾ الكهف: ٦ .[3]

٣- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾﴾ الشعراء: ٣ .[4]

---

(١) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى، كتاب الوديعة- باب ماجاء في الترغيب والترهيب في أداء الأمانات، برقم: ١١٨٩٣.

(٢) فاطر : ٨. واتە: ئایا کەسێ کردەوەی خراپی خۆی لا جوان کرابێ و بەباشی بزانێ (وەك کەسێکە خراپ بزانێ؟) خواش مەیلی لە گومراکردنی هەرکەسێ ببێ بۆخۆی گومرای ئەکا و ویستی لە هیدایەتدانی هەر کەسێك بێت بۆ خۆی هیدایەتی ئەدا. دەی کەواتە خۆت مەفەوتێنە لە خەفەتی ئەوەدا کەوا گومراکراوەکان نەهاتوونەتە سەر ڕێی راست .خوا خۆی ئەزانێ ئەوانە چ کارەن و چی ئەکەن

(٣) الكهف : ٦. واتە: تۆ لەوانەیە خۆت بە خەم و خەفەت بفەوتێنی لە داخی ئەو کافرانە کە باوەڕ بەم قورئانە ناکەن .

(٤) الشعراء: ٣. واتە: لەوانەیە لەبەر ئەوەی ئەم کافرانە موسڵمان نابن تۆ ئەوەندە خۆت نارەحەت بکەیت خۆت بدەی بە کوشت. واتە: بەزەییت بە خۆتا بێتەوەو وا لە خۆت مەکە.

لێرەوە بۆمان هەیە ئازایانە بڕیاری ئەوە بدەین کەوا زەمینەی گفتوگۆ لەنێوان پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوبەشپەرستان زەمینەیەکی شیاوبوو دەکرا بەرهەمی هەبێت و پێ بگات، بۆیە گفتوگۆ لە نێوان پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ و تێکڕای خەڵکی مەککە و کەسە تایبەتەکانیان، ئەو حاجیانەی ڕوویان دەکردە ماڵی خوا بە درێژایی ئەو سێزدە ساڵە بەردەوام بوو کە پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لە مەککە بەسەری برد، قورەیشیەکانیش هاتنە ناو گفتوگۆوە و تێیدا ڕۆچوون، بەڵام بە توندوتیژی نەك بە نەرمی، شێواز و قسەی خراپیان بەکار هێنا، وەك هەموو ئەوانەی بەڵگەکانیان لاوازەو ڕاکانیان ڕزیون ·





## خواستی دووەم

# چەند نمونەیەک لە گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوبەشپەرستان

### کاتێك عوتبە بیستی گوێی بۆ گرت:

محمدی کوڕی کەعب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (بۆیان باس کردوم کەوا عوتبەی کوڕی ڕەبیعە — کە گەورە پیاوێکی داناو هێمن بوو- ڕۆژێك لە یانەی قورەیشیەکان دانیشتبوو، پێغەمبەری خواش ـ درودی خوای لەسەر ـ بەتەنیا لە مزگەوت دانیشتبوو، گوتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش ئەرێ بۆ نەچم بۆ لای ئەو پیاوە و قسەی لەگەڵ بکەم، چەند شتێکی بخەمە بەردەم بەڵکو بە هەندێکیان ڕازی بێت و وازمان لێ بێنێ؟ گوتیان: بەڵێ ئەی باوکی وەلید . ئینجا عوتبە هەستا چووە لای پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ حەدیسەکە باس دەکات عوتبە چی پێ گوتومو چی پێشنیار کردوە بۆی لە سامان و دەسەلات و شتی تر، ئنجا کە عوتبە قسەکانی تەواو بوو پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ پێی فەرموو: قسەکانت تەواو بوو ئەی باوکی وەلید؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی ئەوجار تۆ گوێ لە من بگرە گوتی: وادەکەم پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ﴿ حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ۝٣ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ۝٤ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٌ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٌ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ۝٥ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٌ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ۝٦ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ۝٧ ﴾ فصلت: ١ - ٧ .[(١)]

---

(١) فصلت : ١ـ ٧ . واتە: بەناوی خوای خاوەن بەزەیی میهرەبان (حم) خوای ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چیە. ئەم قورئانە نێرراوەتە خوار لەلایەن خوای بەخشندەو میهرەبانەوە . کتێبێکە ئایەتەکانی تەفصیل دراون و ڕوون کراونەتەوە بە زمانی عەرەبی ئەخوێنرێتەوە بۆ کەسانێك کە خاوەن هۆش و فام بن . مژدەدەرە بەوانەی گوێی بۆ شل ئەکەن ترسێنەرە بۆ ئەوانەی گوێی نادەنێ، بەڵام بەشی زۆریان لایان داوە لە گوێ بۆ گرتنی ئەوانە نابیستن . کافرەکان وتیان: دڵمان بەپەردە داپۆشراوەو پەردەکە ڕێی لە بیستنی ئەوە گرتوە کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ ئەکەی، لە

پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - بەردەوامبوو لە خوێندنەوەی ئایەتەکان، عوتبەش بەبێ دەنگی گوێی بۆ گرتبوو، دەستەکانی بردبوە دواوەو خۆی دابوو بەسەریانداو گوێی شل کردبوو، تاکو پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - گەیشتە ئایەتێك کە (سجدە)ی تێدابوو سەجدەی برد، پاشان فەرمووی: بیستت ئەی باوکی وەلید؟ گوتی: بیستم. فەرمووی: جا ئەوە تۆو ئەوەی بیستت . عوتبە هەستاو بۆلای هاوەڵەکانی رۆیشت ئەوانیش لەبەینی خۆیاندا بەیەکتریان دەگوت: سوێند بەخوا باوکی وەلید بە دەموچاوێکی جیاواز لەوەی پێی رۆیشت گەڕایەوە، هەر کە دانیشت لەلایان گوتیان: چیت هێناوەتەوە باوکی وەلید؟ گوتی: ئەوەم پێیە من سوێند بەخوا وتەیەکم بیست هەرگیز هاوشێوەی ئەوەم نەبیستوە، سوێند بەخوا ئەوە نە شیعرە نە جادووە نە فاڵچێتیە، ئەی کۆمەڵی قورەیش بەگوێی من بکەن و بۆ منی بەجێ بهێڵن. واز لەو پیاوە بهێنن لەگەڵ حاڵی خۆی، سوێند بەخوا ئەو قسەیەی ئەو کە من گوێم لێگرت دەنگ و باسێکی گەورەی دەبێ) [1] .

## چەند سەرنجێك لەو هەڵوێستەی پێشوو:

لەو هەڵوێستەدا چەند ئاماژەیەکی گرنگ هەن سەبارەت بە گفتوگۆو شێوازی دواندن..

پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - بە جوانی گوێی لە عوتبە گرت، دوای ئەو پێشەکیە درێژەی کە چاوەڕوان دەکرا وتاری سەرەکی بێت، ئینجا عوتبە گوتی: چەند پێشنیارێکت دەخەمە بەردەم، ئەویش - درودی خوای لەسەر - بە ئارامی و بە باشترین شێوە وەڵامی دایەوە، کاتێك عوتبە وتەکانی تەواو بوو، پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر -

---

گوێچکەکانمانا گرانیەك هەیە ناهێڵێ ببیستین، لەنێوان ئێمەو ئێوەدا پەردەیەك هەیە ڕێگا نادا بەیەك بگەین، کەواتە تۆ ڕەفتار بە ئاینی خۆت بکەو ئێمەش ڕەفتار بە ئاینی خۆمان ئەکەین . تۆش پێیان بڵێ: من هەر ئادەمیزادێکی وەك ئێوەم وەحیم بۆ ئەکرێ کەوا خوای بەڕاستی پەرستراوی ئێوە لە تاقە خوایەکی تاك و تەنیا بەولاوە نیە، کەواتە بەڕاستی ڕووی تێ بکەن و داوای لێبوردنی گوناهەکانتانی لێ بکەن، هاواریش بۆ حاڵی ئەوکەسانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن . ئەوانەی زەکات نادەن و ئینکاری ڕۆژی دوایی ئەکەن کە ڕۆژی قیامەتە.

(١) أخرجه البيهقي في دلائل الاعتقاد- باب في اثبات نبوة محمد المصطفى ﷺ، برقم ٢٥٠، ونحوه في دلائل النبوة – باب اعتراف مشركي قريش بما في كتاب الله من الاعجاز، حديث رقم: ٥٠٥ .

پەلەی نەکرد لە وەڵامدانەوەی، بەڵکو پرسیاری لێکرد بۆ ئەوەی دڵنیا بێتەوە لەوەی قسەی تەواو بووە.

جا کە دڵنیابوو قسەکانی ئەو تەواو بوون، وای بەباش زانی وەڵامدانەوەی بۆ پێشنیارەکانی عوتبە خوێندنەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بێت، چونکە دەیزانی پاراوترین و شیرین ترین و پرچێژترین وتەیە، بۆیە پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ بە دەنگە ئیمانیەکەی و بە شێوازێکی جوان دەستی کرد بە خوێندنەوەی، خوێندنەوەیەك کە دڵەکان ملکەچی دەبوون دەروونەکان پێی ئارام دەبوونەوە، بۆیە تەنها بە خوێندنەوەکەی ئیکتیفای کرد و لەوە زیاتر یەك وشەی نەگوت، پاشان بە عوتبەی فەرموو: (بیستت ئەی باوکی وەلید) گوتی:بەڵێ، فەرمووی: (دەی ئەوە تۆو ئەوەی بیستت) واتە بۆخۆت هەڵبژێرە، تۆ قسەت کرد من گوێم گرت، منیش قسەم کرد تۆ گوێت گرت، ئێستا تۆ خۆت دەتوانی سەرپشك بی، چونکە ڕاستیەکانت بۆ دەرکەوتوون و شتەکانت بۆ ئاشکرابوون .

ئەو نمونە بەرزە لە گفتوگۆ بوو عوتبەی کرد بە گوێگرێکی باش، بۆیە سەیر نەبوو کاتێك گەڕایەوە لای هاوڕێکانی پێیان گوت: جادوی لێکردووی ئەی باوکی وەلید .

## ڕەوشتێکی جێگیر لە ژیانی پێغەمبەردا ـ درودی خوای لەسەر ـ

تۆ ئەگەر چاوێك بگێڕی بە ژیاننامەی پێغەمبەردا ـ درودی خوای لەسەر ـ دەبینی وتووێژکارێك بووە لە تەرزە ئاوازەکەی، هەمیشە زەمینەی بەپیتی هەبووە بۆ هەر گفتوگۆیەکی بەرهەمدار، چونکە ئەو گوێگرێکی باش و کەم وێنە بوو، گوێی لە هاوەڵە نزیکەکانی دەگرت وەك چۆن گوێی لە خەڵکی گشتی دەگرت، گوێی بۆ سەرسەختترین دوژمنی دەگرت وەك ئەوەی گوێی بۆ خۆشەویستترین خێزانی دەگرت.

## هەرگیز قسە بە بەرامبەرەکەت مەبڕە تاکو قسەکانی تەواو دەکات:

هەروەها گەر ژیاننامەی پیرۆزی بخوێنیەوە لە ژیانی پێغەمبەردا - درودی خوای لەسەر نابینی قسەی بە هیچ کەسێك بڕیبێ تاکو قسەکانی تەواوکردوە ئەگەرچی قسەکەرەکە نەزان بووبێ یان دوژمنێکی پیلانگێڕ بووبێ یان ناحەزێکی گاڵتەجاڕ بووبێ[١].

## پێشنیارێکی سەیر:

لەو سەیرو سەمەرانەی قورەیشیەکان کردیان ئەوەبوو بانگی پێغەمبەریان کرد - درودی خوای لەسەر - بۆ دزێوترین ڕێگەو ڕەفتار ئەویش نۆرەکردنە لەنێوان هاوبەشپەرستی و یەکتاپەرستی، لەنێوان کوفرو ئیمان، گوتیان: ساڵێك ئێمە خوای تۆ دەپەرستین ساڵێکیش تۆ خواکانی ئێمە بپەرستە .

## دینی خۆتان بۆ خۆتان دینی خۆم بۆخۆم:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازی بێت - دەفەرموێ: (قورەیشیەکان داوایان لە پێغەمبەری خوا کرد - درودی خوای لەسەر - بۆ ئەوەی هێندە ماڵ و سامانی بدەنێ بیکەن بە دەوڵەمەندترین پیاوی مەککە، چەند ئافرەتیشی بوێ لێی مارە بکەن..... گوتیان: ئەوە لە ئێمەوە بۆتۆ ئەی محمد، تۆش واز بێنە لە جنێودان بە خواکانمان و بە خراپ باسیان مەکە، ئەگەر ئەوەشت پێخۆش نیە ئێمە ڕێگەیەکی ترت بۆ دادەنێین بۆتۆش باشە. فەرمووی: ئەوە چیە؟ گوتیان: ساڵێك تۆ خوای ئێمە (لات و عوززا) بپەرستە ساڵێك ئێمە خوای تۆ دەپەرستین، فەرمووی: چاوەڕێ دەبم تاکو لەلایەن خواوە فەرمانم بۆ دێت، ئەوەبوو وەحی بۆهات لەلایەن خوای مەزن و لە (لوح المحفوظ)ەوە: ( ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢﴾ الكافرون: ١ - ٢ .[٢] تا کۆتایی سورەتەکە،

---

(١) بڕوانە کتێبی (أسرار القيادة والتأثير، سليمان بن عوض قيمان) ص١٠٣- ١٠٥ .

(٢) الكافرون ١- ٢ . واتە: تۆ ئەی محمد بە کافرەکان بڵێ: من ئەوە ناپەرستم کە ئێوە ئەیپەرستن.

هەروەها خوای گەورە ئەوەی دابەزاند: ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ ﴿٦٤﴾﴾ الزمر: ٦٤ [١]. ﴿بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾ الزمر: ٦٦ [٢]) [٣].

## گفتوگۆ لەگەڵ پزیشکێك:

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازی بێت - دەفەرموێ: (ضماد) پیاوێك بوو لە هۆزی (أزد شنوءة) هات بۆ مەککە، چارەسەری نەخۆشی جنۆکەی دەکرد، لەنەفامەکانی مەککە بیستبووی کە گوتویانە محمد شێت بووە، ئەویش گوتبووی: با ئەو پیاوە ببینم، بەڵکو خوا لەسەر دەستی من شیفای بۆ بنێرێ، دەڵێ گەیشت بە پێغەمبەرو پێی گوت: ئەی محمد من دوعاو نوشتە دەکەم بۆ چارەسەری جنۆکە خوای گەورەش ئەوەی بیەوێ شیفای دەدات لەسەر دەستی من، دەتەوێ بۆتۆشی بکەم؟ پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: (إن الحمد لله، نحمده ونستعينه من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له، وأن محمدا عبده ورسوله، أما بعد).

دەڵێ گوتی: بۆم دووبارە کەوە ئەو وشانە! پێغەمبەری خواش - درودی خوای لەسەر - سێ جار بۆی دووبارە کردەوە، دەڵێ گوتی: من گوێم لە قسەی کاهینەکان و قسەی جادوگەران و قسەی شاعیران بوە بەڵام وێنەی ئەو جۆرە وشانەم لێ نەبیستوون، ئەو وشانە وەکو ناوەراستی دەریا قووڵن .

دەڵێ گوتی: دەستت بێنە با پەیمانت پێ بدەم لەسەر ئیسلام، دەڵێ: جا پەیمانی لێوەرگرت، پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: لە جیاتی قەومەکەشت، گوتی: لە جیاتی قەومەکەشم، دەڵێ: دوای ماوەیەك جارێکیان پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - دەستەیەکی نارد بەلای قەومەکەی ئەودا تێپەڕین، سەرۆکی دەستەکە بە سەربازەکانی

---

(١) الزمر : ٦٤. واتە: تۆ پێیان بڵێ ئەی موحەممەد: ئەوە ئێوە فەرمان بە من ئەدەن عیبادەت و بەندەگی غەیری خوا بکەم ئەی نەفامەکان؟.

(٢) الزمر : ٦٦. واتە: بەڵکو عیبادەت هەر بۆ خوا بکە و لەوانە بە کە سوپاسی خوا ئەکەن .

(٣) أخرجه الطبراني في المعجم الصغير برقم : ٧٥٢.

گوت: هیچ دەستکەوتێکتان لەوانەوە بووە؟ دەڵێ: پیاوێك لەناو دەستەکە گوتی: من کەسێکم لە (ضماد) هێناوە. فەرماندەکە گوتی: بیبەنەوە بۆیان ئەوانە قەومی (ضماد)ن[1].

## دابەزە باوکی وەهەب:

لە ئیبن شهابەوە دەگێڕنەوە کەوا پێی گەیشتوە: (هەندێك لە ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ـ درودی خوای لەسەر ـ موسڵمان دەبوون و کۆچیشیان نەدەکرد مێردەکانیشیان لەوکاتەی ئەوان موسڵمان بوون هەر کافر بوون، لەوانە کچی وەلیدی کوڕی موغیرە کە خێزانی سەفوانی کوڕی ئومەییە بوو ڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوو، مێردەکەشی سەفوانی کوڕی ئومەییە لەبەر ئیسلام ڕایکرد، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ ئامۆزاکەی خۆی وەهەبی کوڕی عومەیری بەدوادا نارد بە جلێکی پێغەمبەری خواوە ـ درودی خوای لەسەر ـ وەك نیشانەی دڵنیایی و لێبوردن بۆ سەفوانی کوڕی ئومەییە، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ بانگی کرد بۆ موسڵمان بوون و داوای لێکرد بێت بۆ لای، ئەگەر دینەکەی بەدڵ بوو وەریبگرێت و موسڵمان بێت ئەگەر بەدڵیشی نەبوو دوو مانگ مۆڵەتی بدات، پاشان ئازاد بێت بۆ هەر کوێ بیەوێ بڕوات، جا کاتێك سەفوان هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ و جلەکەی ئەوی لەبەردابوو، بەبەرچاوی خەڵکەوە بانگی کردو گوتی: ئەی محمد ئەوە وەهەبی کوڕی عومەیر هاتۆتە لام و جلەکەی تۆی هێناوە بۆم دەڵێ گوایە داوات لێکردووم بێم بۆلات ئەگەر بە دینەکەت ڕازی بووم وەری بگرم ئەگەرنا دوو مانگ مۆڵەتم دەدەی، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: باوکی وەهەب دابەزە، وتی: نا بەخوا تاکو بۆم ڕوون نەکەیەوە، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: بەڵکو با چوار مانگ بۆتۆ بێت، ئینجا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ بۆ جەنگی هۆزی (هوازن) ڕۆیشت لە حونەین، ناردی بەدوای سەفوانی کوڕی ئومەییە دا داوای لێکرد ئەو کەل و پەل و چەکەی هەیەتی بیداتێ و دوایی بیداتەوە، سەفوان گوتی: بە ڕەزامەندی خۆمە یان بە زۆرە؟ فەرمووی: بە ڕەزامەندی خۆتە، ئینجا ئەو کەل و پەلو چەکانەی لەلای بوو پێیدا بە ئەمانەت، پاشان

[1] أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الجمعة- باب تخفيف الصلاة والخطبة برقم: ١٤٩١.

لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ـ درودی خوای لەسەر ـ دەرچوو بۆ ئەو جەنگە لەکاتێکدا هێشتا باوەڕی نەهێنابوو، واتە لە جەنگی حونەین و تائیف دا بەشداربوو بەکافری ژنەکەشی موسڵمان بوو، پێغەمبەری خواش لەگەڵ ژنەکەی لەیەکتری جیای نەکردنەوە تاکو سەفوان موسڵمان بوو، خێزانەکەی لەلای مایەوە هەر بەو مارە کردنەی خۆی) [1] .

## شاڵاوە مەزنەکە:

لە مەسروقەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: لەلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بووین خوا لێی ڕازی بێت گوتی: (پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ کاتێك بینی خەڵك پشت هەڵدەکەن و باوەر ناهێنن فەرمووی: خوایە حەوت ساڵ گرانی وەك حەوت ساڵەکەی یوسفیان بۆ بنێری، جا قاتوقڕیەکیان تووش بوو هەموو شتێکی برد، تەنانەت پێستە و مردارەوە بوو کەلاکی بۆگەنیان دەخوارد، وایان لێهاتبوو کە یەکێکیان سەیری ئاسمانی دەکرد تەنها دوکەڵ و تەمی دەهاتە پێش چاو لە برسان، ئەبوسوفیان هاتە لای گوتی: ئەی موحەمەد تۆ فەرمان دەکەی بە گوێڕایەڵی خواو گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، ئەوە قەومەکەت تیداچوون، بۆیان لەخوا بپاڕێوە)، خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ۝١٠﴾ الدخان: ١٠ [2] . تا دەگاتە فەرمایشتی: ﴿يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ۝١٦﴾ الدخان: ١٦ [3] جا (البطشة: شاڵاوە گەورەکە) ڕۆژی بەدر بوو، کەواتە هەرکام لە (الدخان: دوکەڵەکە) و (البطشة: شاڵاوەکە) و (لزام: پێوەنوسان) و ئایەتی روم تێپەڕیون و ڕوویان داوە).

---

(١) أخرجه مالك في الموطأ في كتاب النكاح — باب نكاح المشرك اذا أسلمت زوجته قبله، برقم: ١١٤١، وأخرجه ابن عبدالبر في التمهيد ١٢/ ١٧ عن محمد بن مسلم بن شهاب الزهري وقال: لا أعلمه يتصل من وجه صحيح وشهرة هذا الحديث أقوى من اسناده .

(٢) الدخان: ١٠. واتە: ئەی موحەمەد چاوەڕوانی ڕۆژێ بە ئاسمان دووکەڵێکی دیار و ئاشکرا ئەهێنێ.

(٣) الدخان : ١٦. واتە: لەو ڕۆژەدا تۆڵە ئەسێنینەوە کە پەلامارە گەورەکە ئەبەین.

## جەنگ، گفتوگۆ، موسڵمانبوون

لە داستانی فەتحکردنی مەککەدا و لە باسی موسڵمانبوونی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربدا، گێڕەرەوەکان گفتوگۆیەکمان بۆ دەگوازنەوە کە لەوپەڕی جوانییدایە، عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەوبارەیەوە دەڵێت: (کاتێک ڕۆژ بووەوە ئەبوسوفیانم لەگەڵ خۆم بردە خزمەت پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ ، کە چاوی پێی کەوت، فەرمووی: تیابچیت ئەبوسوفیان کاتی ئەوە نەهاتووە شایەتومان بهێنی کە هیچ خوایەک نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە ـ الله ـ ، گوتی: بە باوک و دایکمەوە بە قوربانت بین چەند میهرەبان و بەڕێز و خزمدۆستی، بەڵێ سوێند بەخوا خەریکە دێمە قەناعەت ئەگەر جگە لە ـ الله ـ خوایەکی تر هەبا دەبوو سوودی هەبا بۆم تا ئێستا، ئینجا فەرمووی: هاواربۆتۆ ئەی ئەبوسوفیان، کاتی ئەوەش نەهاتووە شایەتومان بێنی کە من پێغەمبەری خوام؟

گوتی: بەباوک و دایکمەوە بەقوربانت بین چەندە میهرەبان و بەڕێز و خزمدۆستی، بەڵام بەخوا ئەوەیان هێشتا شتێک لە دڵم ماوە.

عەبباس ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ گوتی: قوڕبەسەرت موسڵمانبە و شایەتومان بێنە، کە هیچ خوایە نییە جگە لە ـ الله ـ و ـ موحەممەد ـ نێرراوی خوایە پێش ئەوەی لە گەردنت بدرێت، دەڵێ: ئینجا شایەتومانی هێنا و موسڵمان بوو.

عەبباس ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەفەرموێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەبوسوفیان پیاوێکە حەزی لە شانازییکردن و ناوبانگە، شتێکی بۆ بکە، فەرمووی: بەڵێ، هەرکەسێک بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان ئەوە سەلامەت دەبێ، هەرکەسێکیش دەرگای ماڵی خۆی لەسەر خۆی دابخات ئەویش ئەمین و سەلامەت دەبێ).[1]

---

(١) اخرجه ابن حجر في المطالب العالية في كتاب السير والمغازي ـ باب غزوة الفتح، برقم: ٤٤٢٨، وقال: هذا حديث صحيح، ورواه الطحاوي في شرح معاني الآثار ٣/٣٢٠، وقال: حديث صحيح.

## ئازادکراوانی خوا (عزوجل):

عەلی کوڕی ئەبوتالیب ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (دوو بەندە ـ کۆیلە ـ لە ڕۆژی سولحی حودەیبییەدا هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ـ دروردی خوای لەسەر ـ پێش ڕێککەوتن و ئەنجامدانی سولح، خاوەنەکانیان نامەیان بۆ پێغەمبەری خوا نووسی، گوتیان: ئەی موحەممەد، سوێند بە خوا، ئەوانە لەبەر خۆشەویستی دینەکەت نەهاتوون بۆ لات، تەنها لەدەست کۆیلایەتی هەڵهاتوون، هەندێک لە خەڵکەکە گوتیان ئەوانە ڕاست دەکەن ئەی پێغەمبەری خوا، بۆیان بنێرەوە، پێغەمبەری خوا ـ درروودی خوای لەسەر ـ تووڕەبوو، فەرمووی: ئەی خەڵکی قورەیش، پێموانییە واز لەو قسانە بهێنن، تاکو خوا کەسێکتان بۆ نەنێرێ لە گەردنتان بدات لەسەری، ئینجا بڕیاریدا نەیاننێرێتەوە، فەرمووی: ئەوانە ئازادکراوی خوان (عزوجل)).[1]

## سوتەمەنی دۆزەخ:

ئیبن عەبباس ـــ خوا لێیان ڕازی بێت ـــ دەفەرموێ: ئایەتێک لە کتێبی خوادا هەیە خەڵک پرســیارم لێ ناکات لەبارەیەوە، جا نازانم لێی تێنەگەیشــتوون بۆیە پرســیارم لێ ناکەن لەبارەیەوە، یان نایزانن و پرسیاریش ناکەن؟ گوتیان: کامەیە؟ فەرمووی: ئایەتەکە:

﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨﴾ الأنبياء: ٩٨.[2]

واتە: (ئێوە و ئەو شتانەشی دەیانپەرستن لەجیاتی خوا ، سوتەمەنی دۆزەخن، ئێوە دەچنە ناویەوە). کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی، خەڵکی مەککە زۆر لەشانیان قورسبوو، گوتیان: موحەممەد جوێنی بە خواکانمان داوە، ئیبن زەعبەری هەستاو گوتی: چی گوتووە؟ گوتیان: دەڵێ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨﴾ الأنبياء: ٩٨ . گوتی: بۆم بانگ بکەن، جا بانگی موحەممەدیان کرد (درروودی خوای لەسەر ـ

(١) أخرجه أبو داود في كتاب الجهاد ـ باب في عبيد المشركين يلحقون بالمسلمين فيسلمون، برقم: ٢٣٦٥.

(٢) الأنبياء : ٩٨. واتە: (پاشان پێیان دەوترێت) بێگومان ئێوە و ئەو شتانەی لە جیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمەنی دۆزەخن و سەڵکە بزوتی ئاگرن، دەبێت هەر بچنە ناوی و هەمیشە تێیدان.

ئیبن زەعبەری وتی: ئەی موحەممەد ئەوە شتێکە تایبەت بە خواکانی ئێمە یان بۆ هەر شتێکە کە جگە لەخوا بپەرسترێ؟ فەرمووی: بۆ هەر شتێکە لەجیاتی خوای مەزن بپەرسترێ، دەڵێ: گوتی لێمان بردەوە، سوێند بەخوای ئەو ماڵە (کەعبە)، ئەی موحەممەد تۆ نالێی عیسا بەندەیەکی چاکەکار بوو، عوزێر بەندەیەکی چاکەکار بوو، فریشتەکان بەندەی چاکەکارن؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: دەی ئەوە گاورەکان عیسا دەپەرستن و ئەوەش جولەکە عوزێر دەپەرستن و ئەوە (بەنو مەلیح)یش فریشتەکان دەپەرستن، دەڵێ: لەناو خەڵکی مەککە بوو بە هەرا و دەنگۆ، ئینجا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١﴾ الأنبياء: ١٠١ [1] واتە: (ئەوانەی لەلایەن ئێمەوە چاکەیان بۆ بڕیاردراوە لەو ئاگری دۆزەخە دوورخراونەتەوە)، هەروەها ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ ٥٧﴾ الزخرف: ٥٧ [2]. واتە: (کاتێک کوڕی مەریەم بەنموونە هێنرایەوە گەلەکەت کردیان بە هەڵڵا و هەرا). یصدون: واتە هەرا و دەنگەدەنگ)[3].

## گوێی ئاژەڵەکان دەقڵیشێنن:

مالیکی کوڕی نەزڵەی جەشمی - خوا لێی ڕازی بێ - دەڵێ: پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - منی دیت جلێکی شڕم لەبەردابوو، فەرمووی: هیچ ماڵ و سامانت هەیە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: چ جۆرە ماڵێک؟ دەڵێ گوتم: خوای گەورە مەڕ و وشتری پێداوم، فەرمووی: کەواتە با نیعمەت و ڕێزلێنانی خوا بەسەرتەوە دیاربێ، پاشان فەرمووی: ئایا وشترەکانت بە گوێچکەی ساغەوە پێدەگەن؟ گوتی: بۆ مەگەر حوشتر هەروا پێناگەن؟ -

(١) الأنبياء: ١٠١. واتە: بەڕاستی ئەوانە کە هەر زوو بڕیارمانداوە چاکە بهێنینەوە ڕێیان (بەهۆی ئیمان و باوەڕ و کردەوەی چاکیانەوە) ئەوانە دوورەپەرێزکراون لە دۆزەخەوە.

(٢) الزخرف : ٥٧. واتە: کاتێکیش باسی کوڕەکەی مەریەم_عیسا_ بەنموونە هێنرابێتەوە، دەستبەجێ قەوم و هۆزەکەی تۆ ملەجەڕێیان کردووە و سەریان باداوە و تەسلیمی حەق نەبوون (بە باسکردنی سەغڵەت بوون).

(٣) أخرجه الطحاوي في مشكل الآثار برقم: ٨١٩، ج٢/ص٤٧١، وأخرج نحوه ابن حجر العسقلاني في موافقة الخبر الخبر ١٧٣/٢ وقال حديث حسن.

ئەو کاتە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو ـ فەرمووی: لەوانەیە موسێک بەدەستەوە بگری گوێی هەندێکیان ببڕی بڵێی ئەوە (بحیر)[1]ە، گوێی هەندێکی تر دوولەت بکەی و بڵێی ئەوەش نادۆشرێ؟ گوتی: بەڵێ وا دەکەم، پێغەمبەر ـ درووردی خوای لەسەر ـ فەرمووی: وامەکە، هەموو ئەوەی خوا بە تۆی داوە حەڵاڵە بۆت، بێگومان مووسی خوا تیژترە و باسکی خوا بەهێزترە (گەرویستبای ئەو وشترانە گوێ بڕاو بن) گوتی: ئەی موحەممەد ئایا ئەگەر بەلای کەسێکدا ڕۆیشتم، بەڵام نانی نەدامێ و میوانداریی نەکردم، پاشان ئەو بە لای مندا هاتەوە من ڕێزی بگرم یان وەک خۆی لەگەڵ بکەمەوە؟ فەرمووی: بەڵکو ڕێزی لێ بگرە و میوانداری بکە)[2].

## دانوستان:

میسوەری کوڕی مەخرەمە و مەروانی کوڕی حەکەم دەگێڕنەوە و دەڵێن: پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر بێ ـ دەرچوو بۆ حودەیبیە، تاکو لەبەشێکی ڕێگادا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێ ـ فەرمووی: خالیدی کوڕی وەلید لە (غمیم)ە، بە چەندج ئەسپسوارێکەوە پێشڕەوی قوڕەیش دەکات، بۆیە لای ڕاست بگرن (مەبەستی خۆلادانبو لێیان)، جا سوێند بە خوا خالید هەستی پێیان نەکرد تا نزیکی سووپاکەی بوونەوە، ئینجا بە ڕاکردنەوە ڕۆیشت بۆ ئاگادارکردنەوەی قوڕەیش، پێغەمبەریش ـ درووردی خوای لەسەر ـ ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو بەرزاییەی بەسەر ئەواندا دەیڕوانی، وشترەکەی چۆکی دادا، هەرچەند خەڵکەکە دەنگیان دا بۆ ئەوەی بڕوات، بەڵام هەر هەڵنەستا، گوتیان (قەصواء) (ناوی وشترەکە بوو) مانی گرتووە، پێغەمبەر ـ درروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: نەخێر، (قەصواء) مانی نەگرتووە و ئەو خوەی نەبووە، بەڵکو ئەوەی فیلەکەی (مەبەستی فیلەکەی ئەبرەهە بوو) ڕاگرت، ئەویشی ڕاگرتووە، پاشان فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی

---

(١) پێش ئیسلام عەرەبەکان گەر وشترێکیان پێنج سکی بکردایە و دوایینەکەیان نێر بوایە، گوێی دایکانەکەیان دوولەت ئەکرد و ئەیانلێشاند ئینجا بەرەڵایان ئەکرد، نە سواری ئەبوون و نە ئەیاندۆشی، (پوختەی تەفسیری نامی) لا١٢٤.

(٢) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى في كتاب الضحايا باب ما حرم المشركون على أنفسهم، برقم: ١٨٣٦٣، وقال الوادعي في الصحيح المسند ١١٠٧: حديث صحيح.

بەدەستە، داوای هەر پلانێکم لێ بکەن تەنها شکۆی حەرامکراوەکانی خوای تێدا پارێزراو بێت قبوڵی دەکەم. پاشان وشترەکەی دەنگ دا و ئەویش هەستایەوە، ئەوجا خۆی لەڕێی ئەوان لادا تاکو گەیشتە ئەوسەری حودەیبیە و لەلای بیرێکی کەم ئاو دابەزین و خەڵک چوونە سەری ئەوەندەی نەبرد ئاوەکەیان تەواو کرد و سکاڵای تینوێتیان بردە لای پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر بێت - ئەویش تیرێکی لە خورجێنەکەی دەرهێنا و فەرمانی کرد بیخەنە ناو بیرەکەوە، جا سوێند بە خوا ئەوەندە ئاوی هەڵقوڵاو زیادی کرد تاکو ئەوەی لێی دوورکەوتنەوە و ئیشیان پێی نەما.

## گفتوگۆی یەکەم: بەدیلی کوڕی وەرقائی دڵسۆز:

لەوکاتەدا کە ئەوان بەوشێوەیە بوون لەناکاو بەدیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی لەگەڵ چەند کەسێک لە خزمەکانی خوزاعە هاتن، ئەوان پێشتریش کەسانی دڵسۆزی پێغەمبەر بوون - درووردی خوای لەسەر - و خەڵکی توهامە بوون.

وتی: من کەعبی کوری لوئەی و عامری کوڕی لوئەیم لە کانیاوەکانی حودەیبیە بەجێهێشت، هەموو کوڕو کاڵیشیان لەگەڵ بوو، ئەوان شەڕت لەگەڵ دەکەن و ڕێگرت دەبن لە زیارەتی کەعبە، پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: ئێمە بۆ جەنگی کەس نەهاتووین، بەڵکو بۆ عەمرەکردن هاتووین، بەڕاستی قوڕەیش شەڕدەگێڕن و زیانیشی لێداون، خۆزگەر دەیانەوێت ماوەیەکیان دەدەمێ، با واز لە نێوان من و خەڵکی بهێنن، جا ئەگەر سەرکەوتم و ویستیان وەک خەڵکی بێنە ناو ئیسلام ئەوا باشە، ئەگەر سەریش نەکەوتم ئەوان قوتاریان دەبێت، ئەگەر بەمانەش ناڕازیین، سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە لەگەڵیان دەجەنگم لەسەر ئەم کارەم تاوەکو لە هاوشانیان پێشدەکەوم و پەروەردگاریش کاری خۆی بەجێ دەگەیەنێت. جا بەدیل وتی: ئەمەی دەیڵێییت پێیان دەگەیەنم، وتی: بەدیل ڕۆیشت هەتا گەیشتە قوڕەیشییەکان و پێی وتن: ئێمە لای ئەو پیاوەوە هاتووین، گوێمان لە قسەیەکی بوو، ئەگەر دەتانەوێت قسەکەتان بۆ بکەین دەیکەین، خەڵکە هەرزەکانیان وتیان: پێویستمان نییە، هیچمان بۆ بگێڕیتەوە، بەڵام ژیرەکانیان وتیان:

چیت لێ بیستووە بۆمان بگێڕەرەوە، وتی: ئاوا و ئاوای دەوت، جا قسەکانی پێغەمبەری خوای ـ دروودی خوای لەسەر ـ بۆ گێڕانەوە.

## گفتوگۆی دووەم: ئایا پێش خۆت عەرەبێکت دیوە کەسوکاری خۆی داگیر بکات؟

جا عوروەی کوڕی مەسعود هەستا و وتی: خزمینە مەگەر ئێوە باوانم نین؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەی من رۆڵەتان نیم؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئایا تۆمەتبارم دەکەن؟ وتیان: نەخێر، وتی: مەگەر نازانن من خەڵکی عوکازم هاندا بۆ پشتیوانیتان کە بە قسەیان نەکردم، بە کوڕ و کەسوکارو ئەوانەی گوێڕایەڵم بوون نەهاتمە ناوتان؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دەی ئەمە پلانێکی ژیرانەی خستووەتە بەردەمتان، دە لێی وەرگرن و واز لە من بهێنن بڕۆم بۆ لای، وتیان: بڕۆ بۆ لای، ئەویش چوو بۆ لای و کەوتە قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ پێغەمبەریش ـ دروودی خوای لەسەر ـ قسەی وەک ئەوانەی بۆ بەدیلی کرد، بەمیشی وت، جا عوروە لێرەدا وتی: ئێ موحەممەد ئایا ئەگەر کاروباری خزمەکانت کەوتە دەست و زاڵ بووی بەسەریاندا، ئایا بیستووتە پێش تۆ لەناو عەرەبدا کەسێک کەسوکارەکەی خۆی داگیر بکات؟ ئەگەر پێچەوانەکەشی دەرچوو، وەڵاهی من کۆمەڵێک بیچم و دەموچاو دەبینم لە دەورت هی ئەوەن کە هەڵبێن و بەجێت بهێڵین؟ جا ئەبوبەکر پێی وت: هینەکەی لات بمژە، ئێمە لێی هەڵدێین و بەجێی دەهێڵین؟ وتی: ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەبوبەکرە، وتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر چاکەیەکت نەبوایە کە بەسەرمەوەیە و پاداشتم نەداویتەوە، وەڵامم دەدایتەوە، دەڵێ: ئیتر کەوتە قسەکردن بۆ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ هەر قسەیەکیشی بۆ دەکرد ریشی پێغەمبەری دەگرت، موغەیرەی کوڕی شوعبەیش لەسەر سەری پێغەمبەرەوە وەستابوو، بە شمشێرە کێلانداڕەکەیەوە، هەرکە عوروە دەستی دەبرد بۆ ریشی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ موغیرە بە کێلانی شمشێرەکەی دەیکێشا بە دەستیدا، پێی دەوت: دەستت بەردە لە ریشی پێغەمبەر ـ دووردی خوای لەسەر ـ جا عوروە سەری بەرزکردەوە و وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: موغیرەی کوڕی شوعبەیە، وتی: ئەی ناپاک، ئەی هەوڵمنەدا لە ناپاکییەکەتدا؟

(وەختی خۆی موغیرە لە نەفامیدا هاوەڵێتی خەڵکێکی کردبوو، کوشتبوونی و سەروەتەکەی بردبوون، پاشان هاتبوو موسڵمان بووبوو)، جا پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: من موسڵمان بوونەکەیم قبوڵکردووە، بەڵام هەقم بە سامان بردنەکەیەوە نییە.

## عوروە دۆخەکە هەڵدەسەنگێنێت:

پاشان عوروە کەوتە سەرنجدانی هاوەڵانی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێت - بە چاوی خۆی دی کە پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر بێت - تفێکی دەکرد یەکسەر دەکەوتە لەپی کەسێکیانەوە و دەیسووی بە ڕوومەت و پێستی دا، کە فەرمانێکی دەکرد، خێرا فەرمانەکەیان بەجێ دەهێنا، کە دەستنوێژی دەگرت، خەریکبوو لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی دەبووە شەڕیان، کە قسەی دەکرد لەگەڵیان ئەوان تەواو دەنگیان لای ئەودا نزم دەکردەوە، لەبەر سام و شکۆی تەماشایان بە زەقی نەدەکرد، ئیتر عورەوە گەڕایەوە لای هاوەڵانی و پێی وتن: خەڵکینە، سوێند بەخوا سەردانی پاشاکانم کردووە، سەردانی قەیسەر و کیسرا و نەجاشیم کردوە، سوێند بە خوا هیچ پاشایەکم نەدیوە هاوەڵانی وەک هاوەڵانی موحەممەد ڕێزی لێ بگرن، سوێند بە خوا کە تفێکی دەکرد یەکسەر دەکەوتە لەپی دەستی کەسێکیانەوە و دەیسووی بە ڕوومەت و پێستیدا، کە فەرمانێکی پێدەکردن، خێرا فەرمانەکەیان بەجێدەهێنا، کە دەستنوێژی دەگرت خەریکبوو لەسەر ئاوی دەستنوێژەکەی ببێت بە شەڕیان، کە قسەی دەکرد لەگەڵیان دەنگیان لای ئەودا نزم دەکردەوە، لەبەر سام و شکۆی بە زەقی تەماشایان نەدەکرد، ئەویش پلانێکی ژیرانەی خستووەتە بەردەمتان تکایە وەریگرن.

## گفتوگۆی سێیەم: کابرای کەنانی:

جا کابرایەکی بەنی کەنانی وتی: ڕێگەم بدەن بچمە لای، وتیان: بڕۆ بۆ لای، کاتێک لە پێغەمبەر و هاوەڵانییەوە دەرکەوت، پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: ئەوە فلانکەسە، ئەوان هۆزێکن حوشتری قوربانییان لا بەڕێز و مەزنە، کەواتە بۆی بهێنن، بۆیان هێناو خەڵکەکە کەوتنە (الله اکبر) کردن، کابراکە ئەمەی دی، وتی: (سبحان الله)، ناکرێت ڕێگری لەمانە بکرێت کە زیارەتی کەعبە بکەن، جا کە گەڕایەوە لای هاوەڵانی وتی:

بینیمن حوشتری قوربانییان ساز و ئامادە کردوە، وا نابینم کە ڕێگەی زیارەتی کەعبەتان لێ بگیرێت.

## گفتوگۆی چوارەم: کابرای خراپەکار:

جا کابرایەک لەناویاندا هەستا، کە پێی دەوترا موکرەزی کوڕی حەفس، وتی: ڕێگەم بدەن بچم بۆ لای، وتیان: بچۆ بۆ لای، کاتێک لێیانەوە دەرکەوت، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەوە موکرەزە کابرایەکی خراپەکارە، ئەویش کەوتە قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ..

## گفتوگۆی پێنجەم: کارەکەتان بۆ ئاسانکرا:

هێشتا موکرەز قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا دەکرد ـ دروودی خوای لەسەر ـ سوهەیلی کوڕی عەمریش هات، موعەمەر دەڵێت، ئەیوب لە عەکرەمەوە بۆی گێڕامەوە: کاتێک سوهەیلی کوڕی عەمر هات، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: کارەکەتان بۆ ئاسانکرا. موعەمەر دەڵێت: زوهری لە فەرموودەکەیدا دەڵێت: جا سوهەیل هات و وتی: بێنە با نووسینێک لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بنووسین، پێغەمبەریش ـ دروودی خوای لەسەر ـ نووسەری بانگکرد و فەرمووی: (بسم الله الرحمن الرحيم)، سوهەیل وتی: بەخوا نازانم (الرحمن) کێیە؟ بەڵکو بنووسە: (باسمک اللهم)، وەک چۆن جاران دەتنووسی، موسڵمانان وتیان: سوێند بەخوا تەنها (بسم الله الرحمن الرحيم) دەنووسین، کەچی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: بنووسە (باسمک اللهم)، پاشان فەرمووی: ئەمە ئەو بڕیارەیە کە موحەممەد پێغەمبەری خوا داویەتی، سوهەیل وتی: سوێند بەخوا گەر بمانزانیبا تۆ پێغەمبەری خوایت، ڕێگەی سەردانی کەعبەمان لێ نەدەگرتی و شەڕمان لەگەڵ نەدەکردی، بەڵکو بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: وەڵلاهی با بە درۆشم بخەنەوە بەڵام من هەر پێغەمبەری خوام، بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا. زوهری دەڵێت: بۆیە وەهای دەکرد،پێشتر فەرموویبووی: داوای هەر ڕێگایەکم لێ بکەن بەو مەرجەی ڕێزلێگیراوەکانی خودا پارێزراو و شکۆدار بمێننەوە پێیان دەدەم. پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: لەسەر ئەوەی ڕێگەم بدەن تەوافی

کەعبە بکەم، سوهەیل وتی: سوێند بە خوا نابێت لەناو عەرەبدا بڵاو ببێتەوە کە ئێمە زۆرمان لێکراوە، بەڵام تەوافەکە دەخەینە ساڵی داهاتووەوە، ئەوەشیان نووسی، ئەوجا سوهەیل وتی: لەسەر ئەوەش هەرکەسێک لەناو ئێمەوە بێت بۆ لای تۆ با بێتە سەر دینەکەی تۆ هەر بۆمان دەگێڕیتەوە، موسڵمانان وتیان: (سبحان الله)، چۆن کەسێک موسڵمان ببێت دەگێڕرێنێتەوە بۆ ناو بتپەرستەکان!

## گفتوگۆی شەشەم: ئەبوجەندەل زنجیرەکەی دەکشێنێت:

ئەوان کە هێشتا خەریکبوون لەوکاتەدا ئەبوجەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر هات کە زنجیر و کۆتەکەی پێوەبوو رایدەکێشا، ئەو لە خوارەوەی شاری مەککەوە هاتبوو، تا خۆی گەیاندە ناوجەرگەی موسڵمانان، جا سوهەیل وتی: ئەی موحەممەد ئەمە یەکەم شتە کە داوای بڕپاردانت لێدەکەم، کە بۆم بگێڕیتەوە، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئێمە هێشتا نووسینەکەمان کۆتایی پێنەهێناوە، وتی: کەواتە سوێند بە خوا هەرگیز لەسەر هیچ شتێک لەگەڵت رێکناکەوم، جا پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: دەی بیبەخشە بە من، وتی: من پێتنابەخشم، فەرمووی: با، ئەوەم بۆ بکە، وتی: من شتی وا ناکەم، جا موکرەز وتی: ئەوا پێمان بەخشیت، ئیتر ئەبوجەندەل هاواری کرد: ئەی گەلی موسڵمانان دەمنێرنەوە بۆ ناو بتپەرستان، کە من هاتووم موسڵمان بووم، ئایا نابینن چیم بەسەرهاتووە؟ چونکە ئەو لەسەر موسڵمانبوونەکەی سزای زۆر سەخت درابوو.

## گفتوگۆی حەوتەم: عومەر دەیەوێت شەڕ بەرپا بێت:

دەڵێت: جا عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ و پێموت: مەگەر تۆ بەڕاستی پێغەمبەری خوا نیت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی مەگەر ئێمە لەسەر حەق نین و دوژمنەکەمان لەسەر بەتاڵ نیە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: کەواتە بۆ سازش لەسەر دینەکەمان بکەین؟ فەرمووی: من پێغەمبەری خوام و سەرپێچی ناکەم، ئەویش سەرمدەخات، وتم: مەگەر پێشتر پێتنەدەگوتین ئەچینە لای کەعبە و تەوافی دەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئایا پێموتی ئەمساڵ دەبێت؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: دەی دەچیت و تەوافیشی دەکەیت، وتی: ئیتر چووم بۆ لای ئەبوبەکر و وتم: مەگەر ئەمە

بەڕاستی پێغەمبەری خوا نییە؟ وتی: بەڵێ، وتم: مەگەر ئێمە لەسەر حەق نین و دوژمنەکەمان لەسەر بەتاڵ نییە؟ وتی: بەڵێ، وتم: کەواتە بۆ سازش لەسەر دینەکەمان بکەین؟ وتی: کابرا، ئەوە پێغەمبەری خودایە و سەرپێچی ناکات، خوداش سەری دەخات، تۆش پێوەی پابەندبە، سوێند بەخوا ئەو لەسەر حەقە، وتم: ئەی پێینەدەگوتین ئێمە دەچینە لای کەعبە و تەوافی دەکەین؟ وتی: با، ئایا پێی وتووی ئەمساڵ؟ وتم: نەخێر، وتی: دڵنیابە دەچیت و تەوافیش دەکەیت. زوهری دەڵێت: عومەر وتوویەتی: لەسەر ئەو گفتوگۆ توندەی کردم دوایی چاکەم دەکرد بۆ قەرەبووکردنەوەی.

## گفتوگۆی هەشتەم: ڕاوێژکردن بە ئوم سەلەمە:

دەڵێت: کە لە نووسینەکە لێبوونەوە، پێغەمبەری خوا ـ درووودی خوای لەسەر ـ بە هاوەڵانی فەرموو: هەستن قوربانیی بکەن و سەرتان بتاشن، دەڵێت: سوێند بە خوا یەک کەس هەڵنەستا تا سێ جاریش دووبارەی کردەوە، کە کەس هەڵنەستا، چووە ژوورەوە بۆ لای ئوم سەلەمە، ئەوەی لە خەڵکەکە تووشی بووبوو بۆی گێڕایەوە، جا ئوم سەلەمە وتی: حەز بەوە دەکەیت؟ بڕۆ دەر یەک قسە لەگەڵ کەس مەکە، تا خۆت قوربانی دەکەیت و سەرتاشەکەت بانگ بکە سەرت بتاشێت، ئەویش هاتەدەرو قسەی لەگەڵ یەک کەسیاندا نەکرد تا وەهای کرد، حوشترەکەی سەربڕی و سەرتاشەکەی بانگکردو سەریتاشیی، کە ئەوەیان دی، هەستان کەوتنە قوربانییکردن و سەرتاشینی یەکتری، تا هەندێکیان خەریکبوو لە خەفەتا بمرێت، پاشان کۆمەڵێک ئافرەتی باوەڕدار هاتن، خوای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٖ فَٱمۡتَحِنُوهُنَّۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّۖ فَإِنۡ عَلِمۡتُمُوهُنَّ مُؤۡمِنَٰتٖ فَلَا تَرۡجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلۡكُفَّارِۖ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُواْۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّۚ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ﴾ الممتحنة: ١٠ [1].

---

(١) الممتحنة : ١٠. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆ لاتان تاقیان بکەنەوەو بەوردیی پرسیاریان لێ بکەن سەبارەت بەکۆچ و هۆی هاتنەکەیان، خوا ئاگادارە بە ئیمانەکەیان، جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن، ئەوە مەیانگێڕنەوە بۆ لای مێردە بێ باوەڕەکانیان، نە ئەم ئافرەتە حەڵاڵی ئەو بێ باوەڕانەن، نەئەو بێ باوەڕانەش حەڵاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانە، ئەو مارەییەی مێردە کافرەکانیان خەرجیان کردووە بۆیان بگێڕنەوە، ئیتر هیچ ڕەخنەیەکیش لەسەرتان نیە ئەو ئافرەتە مارە بکەن کاتێك مارەییان بدەنێ، ئافرەتانی

جا عومەر دوو ژنی کە لە سەردەمی بتپەرستییدا لایبوون تەلاقیدان، معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان یەکێکیانی هێنا و سەفوانی کوڕی ئومەییەش ئەویانی هێنا.

## گفتوگۆی نۆهەم: هەڵگیرسێنەری جەنگ:

پاشان پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - گەڕایەوە مەدینە، ئەبو بەسیریش کە پیاوێکی قوڕەیشی بوو هاتوو موسڵمان بوو، ئەوانیش دوو پیاویان نارد بۆ داواکردنەوەی، وتیان: ئەمە ئەو پەیمانەیە کە پێت داوین، ئەوانیش بردیانەوە تا گەشتنە (ذو الحليفة) لەوێ دانیشتن و دەستیان بە خورما خواردن کرد، جا ئەبوبەسیر بە یەکێک لە پیاوەکانی وت: بە خوا فلانکەس ئەم شمشێرەت جوانە، ئەویش لە کێلانەکە هەڵیکێشا وتی: ئەرێ بەخوا شمشێری چاکە، من چەند جار تاقیمکردووەتەوە، جا ئەبو بەسیر وتی: بمدەیە سەیرێکی بکەم، ئەویش پێیدا، یەکسەر ئەبوبەسیر بە شمشێرەکە هات پیایدا تا ساردی کردەوە، ئەوی دیکەیان رایکرد تا گەشتە مەدینە و خێرا خۆی کرد بە مزگەوتدا، کە پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - بینی، فەرمووی: ئەم کابرا زەندەقی چووە، کە گەشتە پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - وتی: بە خوا هاوڕێکەم کوژراو منیش دەکوژرێم، ئیتر ئەبوبەسیریش هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - سوێند بەخوا پەروەردگار ئەستۆپاکی تۆی ئەنجامدا، تۆ منت دایە دەست ئەوان، بەڵام خودا لەدەستیان رزگاری کردم، جا پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: هاوار بە ماڵی ئەگەر کەسی بەدەستەوە بێت، ئەمە هەڵگیرسێنەری جەنگە، کە ئەبوبەسیر گوێی لەم فەرموودەیە بوو زانی تەسلیمی دەکاتەوە، بۆیە مەدینەی جێهێشت تا گەیشتە کەناری دەریا، دەڵێت: ئەبوجەندەلی کوڕی سوهەیلیشیان لەدەست بەربوو، خۆی گەیاندە ئەبوبەسیر، ئیدی وای لێهات هەرکەسێک موسڵمان دەبوو لە قوڕەیش دەهاتەدەر یەکسەر خۆی دەگەیاندە ئەبوبەسیر، تا دەستەیەک کۆبوونەوە، سوێند بەخوا هەرکە دەیانبیست کاروانێک لای قوڕەیشەوە بەرەو شام دەردەچێت ڕێگەیان لێدەگرت، دەیانکوشتن و

---

کافرمەهێڵنەوە لای خۆتان، واتە مارەیان مەکەن، ئێوەش ئەی ئیمانداران ئەگەر مەسرەفێکتان کردووە لە ئافرەتێکی کافردا داوای بکەنەوە، ئەوانیش ئەگەر مەسرەفێکیان کردووە لە ئافرەتێکی ئیمانداردا با داوای بکەنەوە، ئائەوە حوکم و فەرمانی خوایە، کە خۆی فەرمانڕەوایی دەکات لە نێوانتاندا، خوای گەورەش هەمیشە زانا و دانایە.

**سەروەتەکانیان دەبردن، تا قورەیش نوێنەری نارد بۆ لای پێغەمبەر کە لەبەر خاتری خوا و خزمایەتی، کە بنێرێت بە دوایاندا، لەو کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ الفتح: ٢٤ - ٢٦.[1] **دەمارگیرییەکەشیان ئەوەبوو دانیان نەنابوو بەوەی موحەممەد پێغەمبەری خودایە، دانیشیان بە (بسم الله الرحمن الرحیم) دا نەنا کە بنووسرێت و نەشیانهێشت بچنە تەوافی کەعبە.**[2]



(١) الفتح : ٢٤- ٢٦. واتە: هەر ئەو خوایە دەستی بێ باوەڕانی لەئێوە بەستەوە (نەیهێشت جەنگ بپێت)، دوای ئەوەی ئێوەی زاڵ کرد بەسەریاندا لەناو جەرگەی مەککەدا، خوا هەمیشەو بەردەوام بینایە بەوەی کەدەیکەن. (٢٤) ئەو خراپەکارانەئەوانەن کەبێ باوەڕ بوون و ڕێگەشیان لێ گرتن بگەنە کەعبەی پیرۆزو نەیانهێشت ئەو مەڕومالاتەی کە گل درابوونەوە بۆ قوربانی بگاتەجێی خۆی، خۆ ئەگەر لەبەر ئەو پیاوو ئافرەتانە موسوڵمانانە نەبوایە کە نەتاندەناسین پێشێلتان دەکردن (لەناو شاری مەککەدا بوون و هێشتا کۆچیان نەکردبوو)، بەهۆی ئەوەوە عەیب و عارو باری گرانتان تووش دەبوو لێیانەوە بێ ئەوەی بزانن، (ئەگەر لەبەر ئەوەنەبووایە مۆڵەتی ئێوەمان دەدا بۆ کوشتنیان)، ئەمەش بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار ئەو کەسانەی دەیەوێت و شایستەن بخاتەژێر سایەی سۆزو بەزەیی خۆیەوە، خۆ ئەگەر موسڵمان لە کافران جیابوونایە لە مەککەدا، بێگومان ئێمە بەدەستی ئێوە سزای بەسۆی بێ باوەڕانمان دەدا. (٢٥) سزای ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەبەر ئەوەیە دەمارگیریان خستۆتە ناو دڵ و دەروونی خۆیانەوە، کە دەمارگیریی نەفامی یە، جا خوا ئارامی و ئاسودەیی دابەزاندەسەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران (ئیتر دڵخۆشن بەڕێکەوتنەکە و دەرەنجامەکانی) خوای گەورەش پابەندی خواناسی و پارێزکاری کردن، ئەوان شایستەی ئەو بەهرەیەن و مەردی ئەو ڕێزەن... دڵنیابن هەمیشە و بەردەوام خوا بە هەموو شتێک زانا و ئاگایە.

(٢) أخرجه البخاری فی الجامع الصحیح فی کتاب الشروط برقم ٢٦٠٣.

## مرواریەکی درەوشاوەی مرواریەکانی گفتوگۆ

## بتپەرستێک لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا ـ دروودی خوای لەسەر ـ

ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ مەفرەزەیەکی بەرەو نەجد نارد، ئەوانیش کابرایەکی بەنوحەنیفەیان هێنا کە ناوی سەمامەی کوڕی ئاسال بوو، (لە گێڕانەوەکەی موسلیمدا دەڵێت گەورەی خەڵکی یەمامە بوو) بەستیانەوە بە کۆڵەکەیەکی مزگەوتەوە، جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ چوو بۆ لای، وتی: سەمامە چیت پێیە؟ وتی: ئەی موحەممەد خێرم پێیە، ئەگەر بمکوژیت کەسێکی خاوەن خوێن دەکوژیت، (واتە کەسوکارەکەی خوێنەکەی دەستێنن)، ئەگەر بیشمبەخشیت ئەوا کەسێکی سوپاسگوزار دەبەخشیت، ئەگەر سەروەت و سامانیشت دەوێ چی داوا دەکەیت بیکە، ئیتر ڕۆیشت و تا سبەی جێیهێشت، دوای ئەوە هاتەوە و پێی وت: ئەبو سەمامە چیت پێیە؟ وتی: ئەوەی پێموتی، ئەگەر بمبەخشیت سوپاسگوزارێک دەبەخشیت، دووبارە تا ڕۆژی دواتر جێیهێشتەوە و کە هاتەوە فەرمووی: سەمامە چیت پێیە؟ وتی: هەر ئەوەم پێیە پێموتی، فەرمووی: سەمامە ئازاد بکەن، ئەویش چوو بۆ گۆمێکی نزیک مزگەوت خۆی شۆرد و پاشان هاتەوە مزگەوت و وتی: اشهد ان لا اله الا الله واشهد وان محمدا رسول الله، ئەی موحەممەد سوێند بە خوا لەم سەرزەوییەدا دەموچاوێک نەبووە هێندەی دەموچاوی تۆ رقم لێی بێت، بەڵام ئێستا دەموچاوی تۆ خۆشەویستترین دەموچاوە لام، سوێند بە خوا هیچ ئاینێک هێندەی ئاینەکەی تۆ لام بێزراو نەبوو، بەڵام ئێستا خۆشەویستترین ئایینە لام، سوێند بەخوا هیچ شارێک هێندەی ئەم شارەی تۆ لام بێزراو نەبوو، کەچی ئێستا خۆشەویستترین شارە لام، ئەو کاتەی مەفرەزەکەی تۆ قۆڵبەستیان کردم نیازی عەمرە کردنم هێنابوو ئێستا چی بکەم؟ پێغەمبەری خواش موژدەی پێدا و فەرمانی پێکرد عەمرەکەی ئەنجام بدات، کاتێک کە گەیشتە مەککە کابرایەک پێی وت: لە ئاینی خۆت پەشیمان بوویتەتەوە؟ وتی: نەخێر، بەڵکو لەگەڵ موحەممەدی پێغەمبەری خوادا موسڵمان بووم،

سوێند بەخوا ئیتر لە یەمامەوە دەنکە گەنمێکتان بۆ نایەت هەتاکو مۆڵەتی پێغەمبەری لەسەر نەبێت.[1]

## تێبینی:

## مەسەلەی چوونە مزگەوتەکانەوە لەلایەن کافرانەوە

## لە فەتواکانی شێخ عەبدولعەزیز بنبازدا ئەم دەقە هاتووە:

سەبارەت بە چوونە ناو کەعبە لەلایەن هەموو کافرانەوە دروست نییە وەک: جولەکە، گاور، بتپەرست، شیوعی، هەموو کافران بۆیان دروست نییە بچنە ناو کەعبەوە، خودا دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا﴾ التوبة: ٢٨ .[2] کەواتە پەروەردگار چوونە کەعبەی لێ قەدەغە کردوون.

(المشركون) گاور و جولەکەش دەگرێتەوە، کەواتە دروست نییە بتپەرستان بچنە کەعبەوە، هەروەها بۆ جولەکە و گاور و جگە لەوانیش دروست نییە، بەڵکو چوونە ژوورەوە تایبەتە بە موسڵمانان.

بەڵام بۆ چوونە ناو مزگەوتەکانی دیکە بۆ پێویستییەک یان بەرژەوەندییەک، کێشەی تێدا نییە، تەنانەت مزگەوتی مەدینەش هەرچەندە مەدینە تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام لەو مەسەلەیەدا وەک مزگەوتەکانی دیکە وەهایە، چونکە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ کافرێکی لە مزگەوتەکەی خۆیدا بەستەوە، ڕازییش بوو کە وەفدی سەقیف پێش موسلمان بوونیان بێنە هەمان مزگەوتەوە، بەهەمان شێوەش وەفدی گاوران هاتنە مزگەوتەکەیەوە، ئەمانەش بەڵگەی ئەوەن کە دروستە بچنە مزگەوتی پێغەمبەرەوە، دەی

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي برقم ٤١٣١.

(٢) التوبة : ٢٨. واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە چاک بزانن کە موشریک و هاوەڵگەران ناپوخت و پیسن، ئیتر لەم ساڵەیان بەدواوە نابێت نزیکی مزگەوتی حەرام (کەعبەی پیرۆز) بکەون، خۆ ئەگەر دەترسن لە هەژاری و نەداری و بێ بازاڕی ئەوە بزانن کەلە ئایندەدا خوای گەورە لە فەزڵ و بەخشندەیی خۆی دەوڵەمەندتان دەکات هەر کاتێک بیەوێت (بێگومان سامانی نەوت و کانزاکان بەشێکن لەو مژدەیە) بەڕاستی خوا زاناو دانایە.

مزگەوتەکانی دیکە لەپێشترن، ئەگەر بۆ پێویستییەک بێت، بۆ پرسیارکردن یان هەر پێویستییەکی دیکە، یان بۆ گوێگرتن بێت لە وانەیەک، کە سوودی لێ ببینێت، یان موسڵمان بێت، یان موسڵمانبوونەکەی ئاشکرا بکات، یان هەر شتێکی دیکەی لەو شێوانە.

لە ئەنجامدا ئەگەر بەرژەوەندییەک هەبوو ئەوە دروستە، بەڵام ئەگەر بەرژەوەندییەک نەبوو پێویست بکات بچێتە مزگەوتێکەوە، یان ئەگەر ترس هەبوو بە چوونە ژوورەوە، مزگەوتەکە پیس دەکەن، یاخود کەلوپەلەکەی تێکدەدەن، لەو حاڵەتانەدا قەدەغەیان لێدەکرێت.[١]



(١) انظر فتوى نور على الدرب، المجلد الأول ـ الولاء والبراء ـ مسألە دخول غير المسلمين المساجد.



## خواستی سێهەم

# بە پوختی

هەرچەندە لە شاری مەککەدا بتپەرستان دەسەڵاتدار بوون، بەڵام گفتوگۆ لە نێوان پێغەمبەر و بتپەرستاندا ئەنجامدراوە، هێزی بەڵگە و روونی پەیامەکەی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لە کۆتاییدا ئەوانی ناچار کرد بەدەم بانگەوازەکەیەوە بێن و بەشداری بکەن لە بزاوتی گۆڕانکاری کۆمەڵگەی مەککەدا، بەوشێوەیەی کە خۆیان پێی ڕازی بوون.

پێغەمبەری خوداش ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵیان راهاتبوو کە ئارامگر بێت، مەگەر بەدەگمەن نەبێت، کە ئەوەش سروشتی مرۆیە، جا دەبێت کێ هێندەی محەممەد ئارامگر بێت! هەرچەندە ئەو شوێنە کەمانەش کە پێغەمبەری خودا ـ درودی خوای لەسەر ـ هەڕەشەی تێدا کردووە لە قوڕەیش و وادەی لەناوچوونی پێداون، ئەنجامی باشیان هەبوو، چونکە ئەوان لە کۆمەڵگەیەکدا بوون تەنها دانیان بە هێزدا دەناو تەنها لە زمانی زەبر و زەنگ تێدەگەیشتن، بۆ نموونە:

عەمری کوڕی عاص دەڵێت: (قوڕەیشم نەدیوە نیازی کوشتنی پێغەمبەری خوا بکەن ـ درودی خوای لەسەر بێت ـ تەنها ڕۆژێک نەبێت کە لە پەنای کەعبەدا دانیشتبوون و پێغەمبەری خوداش لای مەقامدا نوێژی دەخوێند، جا عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت چوو بۆی و عەباکەی لە ملی ئاڵاند و توند رایکێشا هەتا ملی شۆڕبووەوە لای ئەژنۆکانی، ئیدی خەڵکەکە وایانزانی کوشتوویەتی، بۆیە کردیان بە هاتوهاوار، لەوکاتەدا ئەبوبەکر خێرا پێراگەیشت و لە دواوە هەردوو شانی پێغەمبەری خوای گرت و وتی: (أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ) ئیتر خەڵکەکە لێی دوورکەوتنەوە و پێغەمبەری خوداش نوێژەکەی تەواو کرد و هەستاو بەلایاندا تێپەڕی کە هێشتا هەر لە پەنای کەعبەدا بوون، فەرمووی: خەڵکی قوڕەیش سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە، من تەنها بۆ سەربڕینتان هاتووم، بە پەنجەش ئاماژەی بۆ قوڕگی کرد، ئەبوجوهەل وتی: ئەی موحەممەد تۆ کەسێکی نەزان نەبوویت، پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر بێت ـ فەرمووی: تۆش لەناویاندای.

لەگەڵ ئەم کاردانەوە سەختەی بۆ ئەو تاقمە ستەمکارە لەو وێستگەدا، کەچی هێشتا ئارامگری و دنیا دیدەیی لە دەست نەدا، چونکە ئەوەندە بەسە کە فریشتەی شاخەکان هاتە لای و مۆڵەتی لەناوبردن و ژێراوژوورکردنی مەککەییەکانی پێبوو، بەڵام هێمنی و ئارامی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر بێت ـ پێشی توورەبوونەکەی کەوتوو فەرمووی: من ئومێدەوارم لە پشتی ئەمانە، خوای پەروەردگار نەوەیەک دەرکات کە تەنها خودا بپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێن.



### باسی دووهەم

# گفتوگۆکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ گاور و جولەکەکاندا



وەختێک زانایانی جولەکەو گاورەکانی نەجران لای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبووبوونەوە و ئەویش بانگی دەکرد بۆ سەر ئیسلام ئەبورافیعی قەرەزی وتی: ئەی موحەممەد دەتەوێت وەک چۆن گاورەکان عیسا دەپەرستن، ئێمەش بەو شێوەیە تۆ بپەرستین؟ کەسێکی گاوری نەجرانیش کە پێی دەوترا رەئیس وتی: ئەی موحەممەد ئەوەت دەوێت لێمان؟ بۆ ئەوە بانگمان دەکەیت؟ جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پەنا بەخوا، ئەگەر جگە لە خودا بپەرستین، یان داوای پەرستنی جگە لە ئەو بکەین، خودا بۆ ئەوەی نەناردووم، بەوەش فەرمانی پێ نەکردوم.

جولەکە و گاور دوو گەلی پێکەوەگرێدراون و یەک شەریعەتیان هەیە، چونکە ئینجیل پێشتر راساندنی تەوراتە، عیسای کوڕی مەریەمیش پشتڕاستکەرەوە و درێژەپێدەری پەیامەکەی موسایە ـ سەلامی خوایان لەسەر ـ .

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ المائدة: ٤٤.[1]

پاش ئەوە دەفەرموێت: ﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ المائدة: ٤٦.[2]

جا لەبەر نموونە زۆری، گفتوگۆ و جیاوازی بابەت و بەشەکانی لەم بارەیەوە، وامبەباشزانی ئەم باسە بکەم بە دوو لقەوە:

### ❊ گفتوگۆی پێغەمبەر لەگەڵ جولەکەکاندا.

### ❊ گفتوگۆی پێغەمبەر لەگەڵ گاورەکاندا.

---

(١) المائدة : ٤٤. واتە: بەڕاستی ئێمە کاتێک تەوراتمان ناردە خوارەوە ڕێنموویی تیادا بوو (بۆ هەموو خێرو چاکەیەک)، نوور و ڕووناکیش بوو (لەناو تاریکایی یەکاندا)، ئەو پێغەمبەرانەی کە هەمیشە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون حوکمی ئەوانەیان پێدەکرد کە ببونە جولەکە، هەروەها زانا پەروەردگار ناسەکانیان و زانا شەرع ناسەکانیشیان، حوکمیان دەکرد بەوەی داوایان لێکرابوو بیپارێزن، کە ئەویش کتێبی خوا (تەوراتە)، هەروەها شایەتیش بوون لەسەری (کەواتە ئەی زانایانی جولەکە، ئەی ئیمانداران) لە خەڵکی مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن، ئایەت و فەرمانەکانی من بەنرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر نرخەکە هەموو دنیاش بێت هەر کەمە) جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن.

(٢) المائدة : ٤٦. واتە: ئینجا بەشوێن ئاسەواری هەموو پێغەمبەرانی (نەوەی ئیسرائیلدا) عیسای کوڕی مەریەممان هێنا، کە ڕاستی تەوراتی دەردەخست و پشتیوانی لێدەکردو ئینجیلیشمان پێدا، کە هیدایەت و نوور و ڕووناکی تێدایە و پشتگیریی تەوراتی پێش خۆیەتی، هیدایەت و ڕێنموویی و ئامۆژگاریە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن.



### بەشی دووهەم (أ):

# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جولەکەکاندا

### باسی یەکەم

## ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەش بۆ گفتوگۆ

## ڕێخۆشکردن:

پێغەمبەری خودا پانتاییەکی فراوانی ڕاخستبوو لەگەڵ جوولەکەکاندا، لە هەموو ئەوانیتر بۆیان نەرمونیانتر بوو، زیاد لە هەر ناموسڵمانێکی تر چاکەی لەگەڵ دەکردن، زۆریی وێستگە گفتوگۆییەکانی و جۆراوجۆرییان، بەڵگەی ڕوونن لەسەر بایەخدانی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە جولەکە، ئەو وتووێژی جوان و نەرمی لەگەڵیان هەبوو، هەمیشە لێبوردەیی و چاوپۆشی هەبوو بۆیان، ئەوەی کە قبوڵیکرد لە خەیبەر بمێننەوە و نیشتەجێ ببن، هەرچەندە پەیمانیان شکاندبوو و ناپاکیان کرد، بەڵام لەگەڵیان ڕێکەوت کە نیوەی داهاتی زەوییە کشتوکاڵییەکان بۆ ئەوان و نیوەکەی دیکەش بۆ موسڵمانان بێ، پێدەچێت لەبەر چەند هۆیەک بووبێت، لەوانە:

* تا لە شاری مەدینەدا تێکەڵییان بکات، هەر لە سەرەتاشەوە پەیمانی لەگەڵ بەستن، هەرچەندە ئەوان لە کۆتاییدا پەیمانەکەیان شکاند.

* پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ تەماحی هەبوو کە موسڵمان ببن، ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرموویەتی: (ئەگەر دە کەسی جولەکە باوەڕیان پێ هێنابام، ئەوا هەموو جووەکان باوەڕیان دەهێنا).[1]

* لای موسلیمیش بەم بێژەیە: (ئەگەر دە کەسی جولەکە باوەڕیان پێ هێنابام، هیچ جولەکەیەک نەدەما لەسەر زەویدا باوەڕم پێ نەهێنێت).[2]

* جولەکە خاوەنی کتێبی ئاسمانی بوون، لەوەندەی لەوکاتەدا لایان مابوو لێی شارەزا بوون، دەیانویست ڕاستگۆیی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ تاقیی بکەنەوە و دڵنیا ببنەوە لەو پەیامەی کە دەیڵێت.

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، باب اتيان اليهود النبي برقم ٣٧٥٢.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب صفه القيامه والجنه والنار، باب نزل أهل الجنه برقم ٥١٢٦.

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

کەشێکی لەبار بۆ گفتوگۆ رەخسابوو، پێغەمبەریش ـ درودی خوای لەسەر ـ لەبەر کۆمەڵێک تایبەتمەندی کە لەمەودوا باسیان دێت رێزێکی تایبەتی لە جوولەکەکان دەگرت.

بەڵگەش لەسەر ئەم رێزگرتنەی لە جولەکە، کە گەلی خاوەن پەیام و شوینکەوتەی پێغەمبەرێکن، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ بە شکۆ و خۆشەویستییەوە باسی موسای کوڕی عیمرانی دەکرد، وەک لەم دوو هەڵوێستەدا دەردەکەوێت:

## موسا پاڵی بە تەنیشت عەرشەوە داوە:

ئەبوهورەیرە دەڵێت: پیاوێکی موسڵمان و پیاوێکی جولەکە بوو بە دەمەقاڵەیان، موسڵمانەکە وتی: سوێند بەو زاتەی موحەممەدی بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردووە، جوەکەش وتی: سوێند بەو زاتەی موسای بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردووە، جا موسڵمانەکە دەستی بەرزکردەوە و مشتەکۆڵەیەکی کێشا بە جووەکەدا، ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ ئەوەی نێوان خۆی و موسڵمانەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ـ دووردی خوای لەسەر ـ فەرمووی: (بژاردەم مەکەن بەسەر موسادا، کاتێک هەموو خەڵک لە هۆش دەچن، من یەکەم کەسم دێمەوە هۆش، دەبینم موسا بە تەنیشت عەرشەوە پاڵی داوەتەوە، جا نازانم ئەویش لە هۆشچوان بووە و بەڵام لە پێش منەوە هاتووەتە سەر خۆی یان خوای پەروەردگار ئەوی هەڵاوێراوە و لە هۆشی نەبردووە).[1]

## ئێمە لە موساوە نزیکترین لە ئێوە:

ئیبن عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ کە هاتە مەدینە، دەبینێت رۆژێک بە رۆژوو دەبن ـ واتە رۆژی عاشورا ـ ، وتیان ئەمە رۆژێکی مەزنە، رۆژێکە خودا موسای رزگار کرد و فیرعەونی خنکاند، موساش وەک سوپاسگوزارییەک رۆژووی تێدا

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الخصومات، برقم ٢٣٠٤.

دەگرت، فەرمووی: من لە موساوە لەوان نزیکترم، جا ڕۆژووی تێدا گرت و فەرمانیشی بە خەڵک کرد ڕۆژووی تێدا بگرن.[1]

## ئەی زەید فێری عیبری ببە:

زەیدی کوڕی سابیت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمانی پێکردم، فێری نووسینی جولەکەکان بووم، فەرمووشی: سوێند بە خوا متمانەم بە جولەکە نییە دەستکاری نامەکانم نەکەن، منیش فێری بووم، تەنها نیو مانگی پێچوو تا بە تەواوی ئاشنای بووم، جا ئەگەر نامەی هەبوایە بۆم دەنووسی، ئەگەر نامەشی بۆ هاتبا بۆم دەخوێندەوە.[2]

هەر لە نموونەی گرنگیدانی تایبەتی بە جولەکە، نەرمونیانی بوو لەگەڵیان، لەوانەش لەم ڕووداوانەدا دەردەکەوێت:

## ـ السام علیک:

عائیشە دەڵێت: جووەکان سڵاویان لە پێغەمبەر دەکرد و دەیانوت: (السام علیک) (مەرگت دەرخوارد بێت)، عائیشە لە قسەکەیان تێگەیشت بۆیە وتی: مەرگ دەرخواردی ئێوە بێت و لەعنەتیشتان لێ بێت، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: عائیشە هێواشبە، پەروەردگار لە هەموو کاروبارێکدا نەرمی پێخۆشە، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ ئایا گوێت لێ نەبوو چیان وت؟ فەرمووی: ئەی گوێت لێ نەبوو منیش وەڵامم دەدانەوە و دەموت: لەسەر خۆتان (وعلیکم).[3]

---

(١) أخرجه البخاری فی الجامع الصحیح فی کتاب حدیث الأنبیاء برقم ٣٢٣٧.

(٢) أخرجه ابوداود فی سننه فی کتاب العلم برقم ٣٢٠٨ واخرجه نحوه الحاکم فی المستدرک فی کتاب الایمان برقم ٢٣١ وقال: هذا حدیث صحیح.

(٣) أخرجه البخاری فی الجامع الصحیح فی کتاب الدعوات، رقم ٦٠٥٤.

## - خەیبەر:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر - ڕەزای خوایان لێ بێت - دەڵێت: پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - خەیبەری بەخشی بە جولەکە کە ئیشی تێدا بکەن و بیکەن بە کشتوکاڵ، لەسەرئەوەی نیوەی بەروبوومەکەی بۆ ئەوان بێت.[1]

## - ئەو ژەهری پێبەخشی ئەم لێبوردن:

ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئافرەتێکی جولەکە بزنێکی ژەهراوی بە پێغەمبەر بەخشی، دەڵێت؛ بەڵام پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - سزای نەدا.[2](*)

## - ستایشی بەشێکی جولەکە بۆ پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - شکۆمەندی زۆریان بۆی

بەو ئەندازەی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - پەرۆشی جولەکەکان بوو، ڕێزی لێدەگرتن و ئومێدی باوەڕهێنانی هەبوو پێیان، لە خەڵکی دیکەی ناحەزی بانگەواز و بێباوەڕان بە پێغەمبەرایەتی جیای دەکردنەوە، بەهەمانشێوە جووەکان دەیانزانی کە ئەو پێغەمبەری ڕاستەقینەیە، ئەو ئاماژە و نیشانانەی لە کتێبەکانیاندا هەبوو کردبوونیان بە بەڵگە لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەری خوا، لە ڕوانگەی چەند هەڵوێستێکیانەوە کە باسیان دەکەین، دەردەکەوێت شکۆ و ڕێزی پێغەمبەریان لابوو و حەزیان دەکرد نزایان بۆ بکات، هەوڵی کوشتنیشیان دا تا ڕاستێتی پێغەمبەرایەتیەکەی تاقیبکەنەوە، وتیشیان پێی (مەبەستمان ئەوەبوو ئەگەر بە درۆ لافی پێغەمبەرایەتی لێدەدەیت لەدەستت بحەوێینەوە، ئەگەر پێغەمبەریش بیت زیانت پێ ناگەیەنێت). لە نیشانەکانی ئەو شکۆو دانپیادانانە ناتەواومیان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەددا - دروودی خوای لەسەر -

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الاجارة، رقم ٢١٨٩.

(٢) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الديات رقم ٢٩٦٥، ٤٤٣٨.

* پێغەمبەر لە حەقی خۆی خۆشبوو، بەڵام (بیشر) کە لەگەڵ پێغەمبەر گۆشتەکەی خوارد و بەو هۆیەوە مرد، ژنەکەیان لە تۆڵەیدا کوشتەوە.

## - بەئەنقەست پژمین لە مەجلیسی پێغەمبەردا - دووردی خوای لەسەر-:

ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت: جولەکەکان لای پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر بێت - خۆیان دەپژماند بەو ئومێدەی پێیان بڵێت: یرحمكم الله، بەڵام ئەو ئەیفەرموو: یهدیكم الله ویصلح بالكم، خوا هیدایەتتان بدات و کاروبارتان چاک بکات.[1]

## - پەرۆشی هەندێک باوکان کە منداڵەکانیان بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - رزگاریان ببێت:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: منداڵی جولەکەیەک نەخۆش کەوتبوو، پێغەمبەری خوا - درورودی خوای لەسەر - چوو بۆ سەردانی، لەسەر سەری دانیشت، پێی فەرموو: موسڵمانبە، منداڵەکە سەیری باوکی کرد، کە ئەویش لای سەری بوو، جا باوکی پێی وت: بە گوێی ئەبولقاسم بکە، ئەویش موسڵمان بوو، ئیتر پێغەمبەری خوا - درورودی خوای لەسەر - هەستا و فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی بە هۆی منەوە لە ئاگر قوتاری کرد.[2]



(١) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الأدب، رقم .

(٢) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الجنائز، رقم ٢٧٣٤.



## خواستی دووهەم

# چەند نموونەیەکی گفتوگۆی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ جوولەکەکاندا

### راستدەکەیت تۆ پێغەمبەریت:

سەوبانی خزمەتچی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر بێت ـ دەڵێت: لای پێغەمبەری خوادا بووم ـ درودی خوای لەسەر ـ کە زانایەک لە زاناکانی جوولەکە هات وتی: ئەی موحەمەد سڵاوت لێ بێت، منیش پاڵێکم پێوەنا وەختبوو بکەوێت، وتی: بۆ پاڵم دەنێیت؟ وتم: بۆ ناڵێی ئەی پێغەمبەری خوا؟ جوولەکەکە وتی: ئێمە بەو ناوەوە بانگی دەکەین کە کەسوکارەکەی لێیان ناوە، پێغەمبەری خوداش فەرمووی: ناوم موحەممەدەو کەسوکارم ئەو ناوەیان لێ ناوم، جووەکە وتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەگەر وەڵامت بدەمەوە هیچ سودێکت پێدەگەیەنێت؟ وتی: بە هەردوو گوێم گوێت لێ دەگرم، جا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ دارێکی بەدەستەوە بوو، دایناو فەرمووی: پرسیار بکە، جولەکەکە وتی: ئەو رۆژەی کە زەوی و ئاسمان دەگۆڕێن بۆ شێوەیەکی تر خەڵک لە کوێ دەبن؟ پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: وان لە تاریکییەکدا لە خوار پردەکەوە، وتی: ئەی کێ یەکەمجار دەپەڕێتەوە؟ فەرمووی: کۆچەرییە هەژارەکان، وتی: کە دەچنە بەهەشت چییان پێ دەدەرێت؟ فەرمووی: زیادەکەی جگەری نەهەنگ، وتی: دوای ئەوە خواردنیان چییە؟ فەرمووی: گای بەهەشتیان بۆ سەردەبڕدرێت کە لە کەناری بەهەشتدا دەلەوەڕێن، وتی: ئەی چ خواردنەوەیەک بەسەریدا دەکەن؟ فەرمووی: ئاوی کانیەک کە سەلسەبیلی پێدەوترێت، وتی: راستت کرد، وتی: هاتووشم پرسیارێکت لێ بکەم، کە لەسەر زەویدا کەس وەڵامەکەی نازانێت جگە لە پێغەمبەر و کەسێک یان دوو کەسیتر، فەرمووی: ئەگەر وەڵامت بدەمەوە سوودێکت پێ دەگەیەنێت، وتی: بەهەردوو گوێم دەیبیستم، وتی: هاتووم پرسیاری منداڵت لێ بکەم، فەرمووی: ئاوی پیاو سپییە و ئاوی ژن زەردە، کە تێکەڵبوون

و تۆوی پیاو باڵا بوو بەسەر تۆوی ژندا منداڵەکەیان نێر دەبێت، بە ئیزنی خودا، خۆئەگەر تۆوی ژن باڵا بوو بەسەر تۆوی پیاودا بە ئیزنی خودا منداڵەکەیان مێ دەبێت، جا جولەکەکە وتی: راستت کرد و تۆ پێغەمبەریت، پاشان رۆیشت، پێغەمبەری خودا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەم کابرا کە پرسیاری ئەو شتانەی لێکردم، من هیچ زانیارییەکم لەسەری نەبوو، تا خودای گەورە پێیدام.[1]

## خەزنەدارانی دۆزەخ:

جابری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: خەڵکێکی جولەکە بە خەڵکێکی هاوەڵانی پێغەمبەریان وت: ئایا پێغەمبەرەکەتان ژمارەی خەزنەدارانی دۆزەخ دەزانێت؟ وتیان: تا پرسیاری لێ نەکەین نازانین، جا کابرایەک هات بۆ لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتی: ئەی موحەممەد ئەمڕۆ هاوەڵانت بەزێنران، فەرمووی: لەسەر چی بەزێنران؟ وتی: جولەکەکان لێیان پرسین ئایا پێغەمبەرەکەتان ژمارەی خەزنەدارانی دۆزەخ دەزانێت؟ وتیان: تا پرسیار لە پێغەمبەرمان نەکەین نازانین، فەرمووی: ئایا خەڵکێک پرسیاری شتێکیان لێ بکرێت و نەیزانن بڵێن نازانین تا لە پێغەمبەرەکەمان دەپرسین بەزێنراون؟ خۆ ئەوانە پرسیاریشیان لە پێغەمبەرەکەیان کرد و وتیان: بە روونی خودامان نیشاندە ببینین، ئەو دوژمنانەی خوام بۆ بانگ بکەن، من پرسیاری خاکی بەهەشتیان لێدەکەم، کە لە وردە دوڕ و یاقوتە، جا کاتێک هاتن وتیان: ئەی باوکی قاسم ژمارەی خەزنەدارانی دۆزەخ چەندە؟ فەرمووی: ئەوەندەیە و ئەوەندەشە، جارێک دە و جارێک نۆ، وتیان بەڵێ وایە، ئەویش لێی پرسین: خاکی بەهەشت لە چییە؟ دەڵێت: کەمێک وەستان، پاشان وتیان: ئەی ئەبولقاسم دەستەوارەیە، فەرمووی: دەستەوارەیەکە لە ئاردی سپی.

## شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەریت:

سەفوانی کوڕی عەسال دەڵێت: دوو جولەکە هەبوون یەکێکیان بەوی دیکەیانی وت: با بچین بۆ لای ئەم پێغەمبەرە و پرسیاری لێ بکەین، ئەویان وتی: مەڵێ پێغەمبەر، ئەگەر

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الحيض باب حضره مني الرجل، برقم ٥٠٥.

بیبیستێت پێی دەڵێت پێغەمبەر، ئەو چوارچاوی هەیە (واتە دەزانێت)، ئیتر هاتن بۆ لای پێغەمبەر، پرسیاری ئەو ئایەتەیان لێکرد: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ الإسراء: ١٠١ [١] ؟ پێغەمبەریش فەرمووی: شەریک بۆ خودا دامەنێن، زینا مەکەن، ئەو گیانە خودا حەرامی کردووە بکوژرێت بە حەقی خۆی نەبێت مەیکوژن، ئیسراف مەکەن، جادو مەکەن، بێتاوانێک مەبەنە لای دەسەڵاتدار کە بیکوژێت، سوو مەخۆن، بوختان بۆ داوێنپاکان مەکەن، لە شەڕی ڕووبەڕووبوونەوەدا هەڵنەیەن ـ شوعبە لەمەدا بەگومان بوو ـ ئەی خەڵکی جوولەکە لەسەریشتان واجبە ڕۆژانی شەممە دەستدرێژی نەکەن، ئەوانیش هەردوو دەست و قاچیان ماچ کردو وتیان: شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەریت، فەرمووی: کەواتە بۆ موسڵمان نابن؟ وتیان: داوود لە خودا پاڕاوەتەوە کە پێغەمبەرێتی لە نەوەیدا نەبڕێت، ئێمە دەترسین گەر موسڵمان بین جوولەکە بمانکوژێت.[٢]

## کە هێمنێک توورە دەبێت:

ئیبن عەباس دەڵێت: جووەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ سەبارەت بە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لێیان پرسی، فەرمووی: خودا لە ڕۆژی یەکشەممە و دووشەممەدا زەوی دروستکرد و شاخەکان و ئەو شتە بە کەڵکانەی تێیدان لە ڕۆژی سێشەممەدا دروستکردن، ڕۆژی چوارشەممەش درەخت و ئاوو ئاوەدانی شار و وێرانەی دروستکرد، ئەمە چوار، خودا دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٩ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ۝١٠﴾ فصلت: ٩ - ١٠ [٣] ڕۆژی

---

(١) الإسراء : ١٠١. واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە نۆ موعجیزەو بەڵگەو نیشانەی ئاشکرامان بە موسا بەخشی.

(٢) أخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح باب: ومن سورة بني اسرائيل برقم ٣١٨٧ وقال هذا حديث حسن صحيح.

(٣) فصلت : ٩- ١٠. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: باشە ئاخر ئێوە باوەڕتان بەو زاتە نیە کە زەوی لە دوو ڕۆژدا دروست کردووە؟ (ئاڵبەتە ئەو ڕۆژانە مەگەر خوا خۆی بزانێت درێژی ماوەکەیان چاندە)، چەند هاوەڵێکیشی بۆ بڕیار دەدەن؟! ئەو بەدیهێنەر و دروستکارە پەروەردگاری هەر هەموو جیهانیان و بوونەوەرە. (٩) لەسەر ڕووکاری زەوی کێوەکانی دامەزراندوە (کە کار دەکەنە سەر ئاوو هەوا، دیمەنی جوان دەسازێنن، لەنگەری

پێنجشەممەش ئاسمانی دروستکرد، ئەستێرەکان و خۆر و مانگ و فریشتەشی لە ڕۆژی جومعەدا دروستکرد، کە سێ ساتی ڕۆژەکە مابوو، لە ساتی یەکەمدا ئاکامی مردنی ئەوانەی دەمرن دروستکرد، لە ساتی دووهەمدا دەردی دا بەسەر هەموو ئەو شتانەی سوودیان بۆ خەڵک هەیە، لە سێهەمیشدا ئادەمی دروستکرد و خستیە بەهەشتەوە و فەرمانی بە ئیبلیس کرد سوژدەی بۆ ببات، لە کۆتایی ساتەکەشدا لە بەهەشت دەری کرد، ئەوجا جوولەکان وتیان: ئەی موحەممەد دوای ئەوە چیتر؟ فەرمووی: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ﴾ الأعراف: ٥٤.[1] وتیان: پێکاوتە ئەگەر تەواویکەیت وتیان: دوای ئەوەی پشووی دا، جا پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر بێت زۆر تووڕە بوو، ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٖ ٣٨﴾ ق: ٣٨.[2][3]

## ويسألونک عن الروح:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: من لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم ـ درودی خوای لەسەر ـ بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەڕۆیشت و خۆی دابوو بەسەر دارێکدا، جا بەلای کۆمەڵێک جولەکەدا تێپەڕی، هەندێکیان بەوانی دیکەیان وت: سەبارەت بە گیان پرسیاری لێ بکەن، هەندێکی تریان وتیان لێی مەپرسن، نەوەک وەڵامێک بداتەوە کە پێتانخۆش نەبێت، ئەوانیتر وتیان: هەردەبێت لێی بپرسین، یەکێکیان وتی: ئەبولقاسم، گیان چییە؟ ئەویش بێدەنگ

---

دەگرن، ڕووبەری فراوانتر دەکەن... هتد) بەرەکەتی زۆری تێدا دابین کردووە (وەک نەوت وجۆرەها کانزا، سەرەڕای جیهانی ڕووەک و... هتد)، هەموو ڕزق و ڕۆزیەکانی تیادا بڕیارداوە هەمووی لە ماوەی چوار ڕۆژدا بە دوو ڕۆژەکەی پێشووشەوە (قەبارە و ڕەنگ و تام و بۆن و وەرز و شوێنی هەر میوە و دەغڵ و دانێک، هەروەها گیانداران و باڵندەکانیش) تا نیازو داخوازیەکانی ئادەمیزاد جێبەجێ بکات.

(١) الأعراف : ٥٤. واتە: پاشان لەسەر عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی وەستا.

(٢) ق : ٣٨. واتە: بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە بەشەش ڕۆژ دروستمان کردوون، هیچ ماندوویەتیەکیش ڕووی تێ نەکردین.

(٣) أخرجه الحاكم في المستدرك، في كتاب التواريخ المتقدمين من الأنبياء والمرسلين، رقم ٣٩٤٥ وقال صحيح الاسناد.

بوو، وتم: ئەوا وەحی بۆ دێت، وەختێک وەحییەکەی لەسەر نەما، فەرمووی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾﴾ الإسراء: ٨٥ [١].[٢]

## ئەوەی ئیسرائیل لەسەر خۆی حەرامکرد:

ئیبن عەباس دەڵێت: دەستەیەک لە جولەکە چوونە لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتیان: ئەی ئەبولقاسم پرسیارت لە چەند پەنهانییەک لێ دەکەین، وەڵاممان بدەرەوە کە جگە لە پێغەمبەر کەسی تر نایانزانێت، جا لەو پرسیارانەی لێیان کرد: ئیسرائیل (مەبەست پێی یەعقوب بوو) پێش ئەوەی تەورات دابەزێت چی لەسەرخۆی حەرامکردبوو؟ فەرمووی: سوێندتان دەدەم بەو زاتەی تەوراتی دابەزاندووەتە سەر موسا، ئایا دەزانن کاتێک ئیسرائیل (یەعقوب) سەلامی لەسەر بێت نەخۆشییەکی سەختی گرت و نەخۆشینەکەی درێژەی خایاند، نەزری لەگەڵ خودا کرد ئەگەر شیفای بدات لەم نەخۆشینە، خۆشترین خواردنەوە و خۆشترین خواردن لای ئەو لەسەرخۆی حەرام دەکات، خۆشترین خواردن لای ئەو گۆشتی حوشتر بوو، خۆشترین خواردنەوەش شیرەکەی بوو، وتیان: بەڵێ.[٣]

## عەرەقی بەهەشتییەکان:

زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێت: کابرایەکی جوولەکە هاتە لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتی: مەگەر تۆ وانازانیت خەڵکی بەهەشت ئەخۆن و ئەخۆنەوە؟ وتی بە هاوەڵانی ئەگەر دان بەمەدا بنێت چەلەحانێی دەکەم، پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: بەڵێ، سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، هەریەکێکیان توانای سەد پیاوی دەدرێتێ لە خواردن و خواردنەوە و حەز و سەرجێیدا، جولەکەکە وتی: دەی ئەوەی

(١) الإسراء : ٨٥. واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چیەو چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لەفەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چیەو چۆنە)و هیچتان پێنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتێکی کەم نەبێت.

(٢) أخرجه البخاری فی الجامع الصحیح کتاب العلم، باب قوله تعالی: وما اوتیتم من العلم .... رقم : ٨٥.

(٣) أخرجه أحمد فی مسنده فی مسند بنی هاشم، مسند عبدالله بن عباس، رقم ٢٣٧٨.

ئەخوا و ئەخواتەوە سەرئاوی پێویستە، فەرمووی: سەرئاوەکەیان عەرەقێکە لە پێستیانەوە دەردەچێت وەک میسک وایە، بەو شێوە سکیان خاڵی دەبێت.[1]

## بانگی کردن رازیی نەبوون، جا بە باشی بەڕێیکردن:

ئەبوهورەیرە دەڵێت: کە لە بەدرا بەوشێوە پێغەمبەری خوا قورەیشی شکاند و هاتەوە مەدینە، جولەکەکانی لە بازاڕی بەنوقەینوقاعدا کۆکردەوەو فەرمووی: ئەی گەلی جولەکە، پێش ئەوەی وەک قورەیشتان لێ بەسەربێت موسڵمان بن، وتیان: ئەی موحەممەد با بە کوشتنی کۆمەڵێک خەڵکی قورەیش لەخۆت بایی نەبیت، ئەوان نەکردە بوون و جەنگیان نەدەزانی، ئەگەر جەنگای لەگەڵماندا ئەوکاتە دەزانیت ئێمە چۆن خەڵکێکین، دەزانیت هەرگیز خەڵکی وەک ئێمەت بەرەوڕوو نەبووەتەوە، جا پەروەردگار ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ۝١٢ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ﴾ [آل عمران: ١٢-١٣].[2][3]

## هەورە تریشقەمان پێ بڵێ:

عەبدوڵلای کوڕی عەباس دەڵێت: (کۆمەڵێک جولەکە هاتن بۆ لای پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - وتیان: هەورە بروسکەمان پێ بڵێ چییە؟ فەرمووی: فریشتەیەک لە فریشتەکان بەرپرسیارە لە هەورە بروسکە، قامچیەکی پێیە بۆ کوێ خودا بیەوێت دەیبات، وتیان: ئەی ئەو دەنگە چییە دەیبیستین؟ فەرمووی: هاژەی هەورە، کە هاژە دەکات بۆ ئەو شوێنەی فەرمانی پێکراوە، وتیان راست دەکەیت، جا وتیان: هەواڵمان بدەرێ ئیسرائیل چی لەسەر

---

(١) أخرجه البيهقي في البعث والنشور في باب ما جاء في طعام أهل الجنه برقم ٣٠٥ وقال الألباني: صحيح.

(٢) آل عمران : ١٢- ١٣. واتە: )ئەی محمد (ﷺ) بڵێ بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە: سەرئەنجام تێکدەشکێن و ژێردەست دەخرێن (لە دنیادا، لە ڕۆژی دوایشدا) کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ کە ناخۆشترین جێگەیە. (١٢) (ئەی محمد (ﷺ) بەو خەڵکە بڵێ) بێگومان لەو دوو دەستەیەی کە لە (جەنگی بەدردا) ڕوو بە ڕووی یەکتر وەستان نیشانەو پەندێکی گەورە بوو بۆتان، دەستەیەکیان لە پێناوی خوادا دەجەنگان، دەستەکەی تریان بێ باوەڕ بوون.

(٣) أخرجه أبوداود في سننه في كتاب الخراج والإماره والفيء ، باب كيف كان إخراج اليهود من المدينة، رقم ٢٦٤٩.

خۆی حەرامکردبوو؟ فەرمووی: نەخۆشی (عرق النساء) دەردە دەلاقەی هەبوو هیچی دەستنەدەکەوت گونجاو بێت لەگەڵی جگە لە گۆشت و شیری حوشتر، لەبەرئەوە حەرامی کرد، وتیان: راست دەکەیت.[1]

## ویستیان پێغەمبەری بێگەرد فریو بدەن:

عەبدوڵلای کوڕی عەباس دەڵێت: کەعبی کوڕی ئەسەد و ئیبن سەلەوبا و عەبدوڵلای کوڕی سوریا و شەئسی کوڕی قەیس بە یەکتریان وت: با بچین بۆ لای موحەممەد بەڵکو لە دینەکەی لایدەین! جا هاتنە لای، وتیان: ئەی موحەممەد تۆ دەزانیت ئێمە زانا و پیاوماقوڵان و سەرگەورەکانی جولەکەین، خۆئەگەر ئێمە شوێنت بکەوین هەموو جولەکە شوێنمان دەکەون و سەرپێچیمان ناکەن، لە نێوان ئێمەو خزمانماندا گرفتێک (خصومە) هەیە، دەیهێنینە لای تۆ، جا تۆش بڕیارەکە بۆ ئێمە بدە لەسەر ئەوان، پێغەمبەری خوا بەوە رازی نەبوو، ئیتر خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾ المائدة: ٤٩ - ٥٠.[2][3]

---

(١) أخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح في ابواب التفسير باب ومن سورة الرعد رقم ٣١٦٠.

(٢) المائدة : ٤٩ـ ٥٠. واتە: )کاتێک هەندێک لە زاناکانی جوو، هاتن بۆ لات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیە (قورئانە)ی کە لەلایەن خواوە بۆت دابەزیووە، شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان رێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێک لەو رێنموویانەی کە خوا بۆی ناردوویت (جا ئەگەر ئەو جولەکانە رازیی نەبوون) و پشتیان هەڵکرد، ئەوە بزانە بەڕاستی خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێک لە گوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخی و سەرکەش و تاوانبارن. (٤٩) ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

(٣) أخرجه البيهقي في دلائل النبوة باب ما جاء في دخول عبدالله بن سلام رقم ٧٨٥ قال أحمد شاكر: صحيح حسن غريب وقال الألباني: صحيح.

## چاوانی دەنوێت و دڵی خەبەردارە:

عەبدوڵلای کوڕی عەباس دەڵێت: جولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتیان: ئەی ئەبولقاسم لەسەر چەند شتێک لێت دەپرسین ئەگەر وەڵامماں بدەیتەوە شوێنت دەکەوین و باوەڕت پێدەهێنین و راساندنت دەکەین. دەڵێت: پێغەمبەریش ـ دروودی خوای لەسەر ـ ئەوە پەیمانەی کە یەعقوب لەسەر خۆی دانا لێی سەندن وتیان: (والله على ما نقول وكيل)، وتیان: نیشانەی پێغەمبەرمان پێ بڵێ؟ فەرمووی: چاوی دەنوێت و دڵی نانوێت، وتیان: پێمان بڵێ: چۆن ئافرەت مێ دەبێت و پیاو نێر دەبێت؟ فەرمووی: دوو ئاوەکەیان بەیەک دەگەن، ئەگەر ئاوی ژن باڵا بوو بەسەر ئاوی پیاودا مێ دەبێت، وتیان: راست دەکەیت، ئەی هەورە تریشقە چییە؟ فەرمووی: هەورە تریشقە فریشتەیەک لە فریشتەکان بەرپرسی هەورەکانە، قامچیەکی ئاگرینی بەدەستەوەیە هەوری پێ دەهەژێنێت دەکات، ئەو دەنگەشی کە لێی دەبیسترێت هاژەی هەورەکەیە کە لێیدەدات بۆ ئەو شوێنەی فەرمانی پێ دەکات.[1]

## کابرایەکی ملهوڕ و پێنەزانە:

عەربازی کوڕی ساریەی سەلەمی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵی بوون دابەزینە ناو خەیبەر، گەورەی خەیبەر کابرایەکی ملهوڕ بوو، رویکردە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ و وتی: ئەی موحەممەد ئایا بۆتان هەیە حوشترەکانمان سەربڕن و بەروبوومەکانمان بخۆن و ژنەکانمان بخوازن؟ جا پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ تووڕە بوو فەرمووی: کوڕی عەوف سواری ئەسپەکەت ببەو بانگەواز بکە: بەهەشت تەنها بۆ باوەڕدارانە و کۆببنەوە بۆ نوێژ، دەڵێت کۆبوونەوە و پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ نوێژی بۆ کردن و پاشان هەستاو فەرمووی: ئایا کەسێکتان لەسەر کورسیەکەی پاڵ دەداتەوە و وادەزانێت کە خودا تەنها لە قورئاندا شتی حەرام کردووە؟ ئاگاداربن سوێند بەخوا من ئامۆژگاریمکردووە و فەرمان و نەهیشمکردووە

(١) أخرجه الطبراني في المعجم الكبير برقم ١٢٢٣٩ وقال الألباني في سلسله الصحيحه ١٩١/٤ صحيح.

لە کۆمەڵە شتێک کە وەک قورئان یان زیاترە، خوای گەورە مۆڵەتی نەداون کە بچنە ماڵی ئەهلی کیتاب بە مۆڵەت نەبێت، هەروەها ڕێگەی نەداوە بە ژن خواستنیان و خواردنی بەروبوومەکانیشیان، ئەگەر ئەوەی لەسەریانە بتاندەنێ.[1]

## گەلێکی بوختانچی:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی سەلام خەریکی کێڵانی زەوی بوو، کە بیستی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ هاتووە بۆ مەدینە هات بۆ لای و وتی: من سێ شتت لێ دەپرسم جگە لە پێغەمبەران کەس نایانزانێت، یەکەم مەرجی هاتنی ڕۆژی قیامەت چییە؟ یەکەم خواردنی بەهەشتییەکان چییە؟ منداڵ چۆن لە باوکی یان دایکی دەچێت؟ فەرمووی: ئێستا جوبرەئیل پێی وتم، وتی: جوبرەئیل! فەرمووی: بەڵێ، وتی: ئەوە لەناو فریشتەکاندا دوژمنی جولەکەیە، ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ البقرة: ٩٧[2] یەکەم: مەرجی هاتنی قیامەت، ئاگرێکە خەڵک لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە کۆدەکاتەوە، یەکەم خواردنی بەهەشتییەکان، زیادەی جگەری نەهەنگە، ئەگەر ئاوی پیاویش پێش ئاوی ژن کەوت، کوڕ دەبێت و ئەگەر ئاوی ژن پێش کەوت کچ دەبێت، وتی: **أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أنک رسول الله**، ئەی پێغەمبەری خوا، جولەکە گەلێکی بوختانچین، ئەوان ئەگەر پێش پرسیارلێکردنیان بزانن من موسڵمان بووم بوختانم بۆ دەکەن، جا جولەکە هاتن و پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ پێی وتن: عەبدوڵلا لەناوتاندا چۆن پیاوێکە؟ وتیان: باشترین کوڕی باشترینمانە، گەورەی کوڕی گەورەمانە، فەرمووی: ئەی ئەگەر بینیتان عەبدوڵلای کوڕی سەلام موسڵمان بوو؟ وتیان: خوا لەوە پەنایدا، جا عەبدوڵلا کە خۆی شاردبووەوە لێیان هاتەدەرەوە و وتی: **أشهد أن لا اله الا الله، وأن محمد رسول الله**، وتیان: خراپی کوری

---

(١) أخرجه البخاری فی الجامع الصحیح فی کتاب تفسیر القرآن سوره البقره، باب من کان عدوا لجبریل.. رقم ٤٢٢٨.

(٢) البقرة : ٩٧. واتە: )ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیلە، (با بزانێت) کە هەر ئەو جوبرەئیلە بە فەرمانی خوا ئەو قورئانەی دابەزاندۆتە سەر دڵت کە کتێبە پێشووەکان بەڕاست دادەنێت و ڕێنموویی (بۆ چاکە) دەکات و مژدە بەخشیشە بە ئیمانداران.

خراپمانە و کەوتنە شکاندنی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ ئەمەبوو لێی دەترسام.[1]

## ئەمە لە ئاستی زانستی خوادا کەمە:

ئیبن عەباس دەڵێت: زانای جولەکەکان بە پێغەمبەری خودایان وت: ئەی موحەممەد، ئەم قسەیەت کە دەیکەیت (وما اوتیتم من العلم الا قلیلا) مەبەستت ئێمەیە یان گەلەکەی خۆت؟ پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: هەردووکیان، وتیان: ئەی مەگەر لەوەی بۆت هاتووە نایخوێنیتەوە: کە ئێمە تەوراتمان بۆ هاتووە کە هەموو شتێک روون دەکاتەوە، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەوە لە ئاستی زانستی خوادا کەمە، ئەوەشتان لایە بەستانە، جا لەسەر ئەو پرسیارەی لێیانکرد خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾﴾ لقمان: ٢٧ .[2][3]

## مرواریەکی درەوشاوەی مروارییەکانی گفتوگۆ:

عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووم ـ درودی خوای لەسەر ـ تا گەیشتینە کەنیسەیەکی جولەکە لە مەدینەدا، چوونەکەی ئێمەیان پێ خۆش نەبوو، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ پێی فەرموون: ئەی خەڵکی جولەکە، دوازدە پیاوی جولەکەم نیشاندەن کە شایەتی بدەن کە جگە لە (الله) پەرستراوێکی دیکە نییە و منیش پێغەمبەری خوام، ئەوکاتە خودا ئەو غەزەبە لەسەر هەموو جولەکەیەکی ژێر ئەم ئاسمانە هەڵدەگرێت، کە لێی گرتوون، دەڵێت: بێدەنگ بوون و کەسیان وەڵامیان

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن سورة البقرة، باب من كان عدوا لجبريل.. رقم ٤٢٢٨.

(٢) لقمان : ٢٧. واتە: خۆ ئەگەر بەڕاستی هەرچی درەخت هەیە لە زەویدا ببنە پێنووس، دەریاش چەندەیە ببێتە حەوت ئەوەندە و (ببێتە مرەکەف و زانستی ونهێنی دروستکاوەکانی خوا بنووسنەوە)، ئەوە هێشتا زانست و زانیاری و فەرمانەکانی خوا هەر تەواو نابێت، بەڕاستی خوای گەورە بەدەسەڵاتە و دانایە.

(٣) أخرجه الطبري في تفسيره في تفسير سورة لقمان برقم ٥٧٩٨.

نەدایەوە، پاشان لێیانی دووبارە کردەوە، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، پاشان سێ بارەی کردەوە، هەر وەڵامیان نەدایەوە، فەرمووی: رازی نابن؟! دە سوێند بە خوا، من کۆکەرەوەم، من دواهەمینم، من شکۆدارم، باوەڕبهێنن یا نەیهێنن، پاشان رۆیشت و منیش لەگەڵیبووم، تاوەکو نزیکبوو دەرچێت، کەچی کابرایەک لە پشتمانەوە وتی: ئەی موحەممەد لەجێی خۆت بە، دەڵێت ئەو پیاوە وتی: ئەی گەلی جولەکە من چۆن پیاوێکم لەناوتاندا؟ وتیان: کەس لەناوماندا ناناسین زاناتر و تێگەیشتووتر بێت لە تەورات لە تۆ، هەروەها لە باوکت و لە باپیریشت بەرلەباوکت، جا وتی: دەی من شایەتی بۆ دەدەم کە ئەمە پێغەمبەری خوایە، کە لە تەوراتدا باسکراوە، وتیان: درۆ دەکەیت! پاشان کەوتنە وەڵامدانەوەی و خراپیان پێ وت: جا پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: درۆتان کرد، تازە بە قسەتان ناکات، خۆ ئێستا ستایشی چاکەتان دکرد هەرکە باوەڕی هێنا بە درۆتانخستەوە و ئەو قسانەی پێ دەڵێن، ئەو قسەکانتان قبوڵ ناکات، دەڵێت کە دەرچووین بووین بە سێ کەس، پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - و من و عەبدوڵلای کوڕی سەلام، جا پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ۝٥٢﴾ فصلت: ٥٢ [١]. [٢]



(١) فصلت : ٥٢. واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ، باشە، ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێت، پاشان ئێوەش بڕواتان پێی نەبێت، دەزانن چ سەرئەنجامێکی سامناک چاوەڕێتانە؟. جا ئیتر کێ هەیە لە ئێوە سەرسەختترو لاڕێتر لەوەی کە ڕێگەی جیاو دوور لە ڕاستی گرتبێتەبەر.

(٢) أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب اخباره - صلى الله عليه وسلم - عن مناقب الصحابه، باب ذكر عبدالله بن سلام برقم ٧٢٧٧ وقال الالباني في صحيح الموارد ١٧٦٤ صحيح.

## ڕێخۆشکردن

گاورەکان بەشێکبوون لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دورگەی عەرەبی، لە خوارووی دورگەی عەرەبی نزیک یەمەن نیشتەجێ بوون، لە ناوچەی نەجران، پێغەمبەری خودا - دروودی خوای لەسەر - لەگەڵ هەموو کەسێکدا پیشەی نەرمونیان بوو، خۆئەگەر چاکەی لە خەڵکێکدا بەدی کردبا ئەو چاکەی زیاتری لەگەڵ دەکرد و بە لوتف و نەرمونیانییەکەی دایدەپۆشی.

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

لە نموونەی تایبەتکردنی زیادە چاکە و نەرمونیانی لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا ئەوەبوو کە لەگەڵ گاورەکانی نەجراندا کردی، کە ئەوپەڕی ڕێزگرتن و لوتفی بۆ نواندن، ئەمەش دوو نموونە لەو ڕێزلێگرتنەیان:

## - کەنیسە مەڕووخێنن و قەشەش دەرمەکەن:

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەڵێت؛ پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - لەگەڵ خەڵکی نەجران ڕێکەوت لەسەر دوو هەزار کاڵا (حلة) نیوەی لە مانگی سەفەردا بدەن بە موسڵمانان و ئەویدی لە ڕەجەب دا، پاشان سی قەڵغان و سی ئەسپ و سی حوشتر و سی جۆر چەکی لێ خواستن کە غەزای پێ بکەن، خۆئەگەر یەمەنیان بەهۆی فێڵ و تەڵەکە یان ناپاکییەوە لەدەستچوو، موسڵمانان گرنتی گەڕانەوەیان بدەن، لە بەرامبەردا کەنیسەیان نەڕوخێنرێت و قەشەیان دەرنەکرێت، بەزۆر لە دینەکەیان وەریاننەگێڕن، بەمەرجێک کوشتار نەکەن و سوو نەخۆن.[1]

---

(١) أخرجه أبوداود في سننه في كتاب الخراج والامارة والفيء باب أخذ الجزية برقم ٢٦٨٦.

## ـ نوێژکردنیان لە مزگەوتی پێغەمبەردا ـ دروودی خوای لەسەر ـ

ئیبن قەیم هێناویەتی[1]؛ (لە پێغەمبەری خواوە ـ دروودی خوای لەسەر ـ کە وەفدێکی گاورەکانی لە مزگەوتەکەیدا دابەزاند، کە کاتی نوێژکردنیان هات لە مزگەوتەکەدا نوێژیان کرد).[2]

## لە نموونەی رێزگرتنی ئەوانیش لە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ

## ـ رێگرتن لە خۆیان کە موباهەلە بکەن

ئیبن کەسیر دەڵێت: هەروەها پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ دوای ئەوەی ئیقامە حوججەی لەسەر وەفدی نەجران کرد لە رووبەڕووبوونەوەدا و ئەوان هەر دەمەقاڵێ و ئینکاریان دەکرد، داوای موباهەلەی لێکردن، خوا دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾﴾ آل عمران: ٦١[3] کە ئەوەیان بینی بە یەکتریان وت؛ سوێند بە خوا ئەگەر موباهەلە لەگەڵ ئەم پێغەمبەرەدا بکەن چاوێکتان نامێنێت بتروکێت، لەوکاتەدا ملیان بە رێککەوتن دا و جزیەیان بەسەر کزی دا، ئەویش لەسەری دانان و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی لەگەڵ ناردن تا ئەمینیان بێت.[4]

---

(١) انظر أحكام أهل الذمة ٢٩٧/١ بسند صحيح.

(٢) وە ئەم چیرۆکە بە درێژی هەیە لە جامع البيان في تفسير سورة آل عمران برقم ٥٩٧١.

(٣) آل عمران: ٦١، واتە: )دوای ئەوەی کە هەموو ئەو راستیانەت پێکەیشت دەربارەی عیسا)، جا ئەگەر کەسانێک هەر موجادەلەیان کردوو لەسەری رۆیشتن و شتی نارەوایان دەربارەی عیسا وت، تۆیش پێیان بڵێ؛ وەرن با کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە، خۆمان و خۆشتان بانگ بکەین و ئامادەبین (لە شوێنێکی تایبەتدا)، پاشان لە خوا بپاڕێنەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا داببارێتە سەر درۆزنەکان.

(٤) انظر تفسير ابن كثير، ٢٣٢/١.

## ـ ئەوەی داوای دەکەیت دەتدەینێ:

حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێت: دەمسیی و گەورەی نەجران هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ نیازیان وابوە لەعنەتکۆڕینەوەی لەگەڵ بکەن، جا یەکێکیان بە هاوەڵەکەی تری وت: مەکە، سوێند بە خوا ئەگەر ئەمە پێغەمبەر بێت و ئێمە لەعنەتکۆڕینەوەی لەگەڵ بکەین نە ئێمە نە نەوەکانی دوای ئێمە قوتاریان نابێت، جا وتیان: ئێمە ئەوەی دەتەوێت دەتدەینێ، تۆش پیاوێکی ئەمینمان لەگەڵ بنێرە، ئەگەر ئەمین نەبێت مەینێرە، فەرمووی: ئەمینێکتان لەگەڵ دەنێرم بەڕاستی ئەمین بێت، هاوەڵانی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ حەزیان دەکرد کە ئەوان بن ـ ، فەرمووی: ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح هەستە، کە هەستا، پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەمە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە.[1]



(١) أخرجه البخاري في كتاب المغازي، باب قصه أهل النجران، برقم ٤١٣٧.



# باسی دووهەم

# چەند نموونەیەک لە گفتوگۆری پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ گاورەکاندا

## ئایا جگە لە خودا پەرستراوێکی دیکە شک دەبەن؟

عەدی کوڕی حاتەم دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ کە لە مزگەوتدا دانیشتبوو، خەڵکەکە وتیان ئەوە عەدی کوڕی حاتەمە، منیش بەبێ پەنادان و ڕێکەوتنێک هاتبووم، کاتێک خۆم پێ گەیاند دەستی گرتم، ئەو لەوەوپێش فەرمووبووی ئومێدەوارم لە پەروەردگار دەستی بخاتە ناو دەستم، وتی: هەستا، ئافرەتێک کە منداڵێکی لەگەڵ بوو پێی گەیشتن، وتیان: ئیشمان پێتە، ئەویش لەگەڵیان چوو تا پێویستییەکەی دەرکردن، پاشان دەستی گرتم تا بردمیەماڵی خۆیان، منداڵێک ڕاخەرێکی بۆ هێنا لەسەری دانیشت و منیش لایا دانیشتم، جا سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی: چ زیانێک دەکەیت گەر بڵێیت (لا اله الا الله)، جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر شک دەبەیت؟ دەڵێت: وتم نا، دەڵێت: پاشان ماوەیەک قسەی کرد، پاشان فەرمووی: لەوە هەڵدێیت کە بڵێیت (الله اكبر) وا دەزانیت شتێک هەبێت لە خوا گەورەتر؟ وتم: نا، فەرمووی: جوولەکە غەزەبیان لێگیراوە و گاورەکانیش سەریان لێشێواوە، دەڵێت وتم: هاتووم موسڵمانم، دەڵێت: ڕوخساریم بینی لە خۆشیدا گەشایەوە و پاشان فەرمانی بە هاوەڵانی کرد و بووم بە میوانی ئەنسارییەک، ئێواران و بەیانیان دەهاتمەوە خزمەتی، جارێکیان ئێوارەیەک لایبووم، خەڵکێک کە جلوبەرگی خوری هەژارانەیان لەبەردابوو هاتن بۆ لای، دەڵێت: نوێژی کرد و دەستیکرد بە هاندانی خەڵک بۆ هاوکارییان، پاشان فەرمووی: با بە ڕبەیەک، یان نیو ڕبە خۆراکیش بێت، یان مشتێک یان نیو مشت بێت، یارمەتیان بدەن، ڕوخساری خۆتان لە دۆزەخ یان ئاگر بپارێزن با بە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێت، چونکە یەکێک لە ئێوە دەگاتە پەروەردگاری و ئەمەی پێتان دەڵێم، ئەویش پێی دەڵێت: ئایا بیستن و بینینم پێ نەداون؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، جا پێی دەڵێت: سامان و منداڵم پێنەبەخشیبویت؟

دەڵێت: بەڵێ، دەڵێت: دەی چیت پێش خۆت خست؟ ئەویش سەیری پاش و پێش و ڕاست و چەپی خۆی دەکات، هیچ نابینێت ڕوخساری خۆی پێ قوتار بکات، ڕاستییەکەی من لە هەژاربوونتان ناترسم، چونکە خودا سەرخەر و بەخشەرتان دەبێت، ئەوەندەتان پێدەبەخشێت تا ئافرەتێک لە نێوان یەسریب و حیرەدا دەچێت لە دزرانی وڵاخەکەی ژێری ناترسێت، دەڵێت: منیش لە دەروونی خۆمدا دەموت: ئەی دزەکانی تەی چیان بەسەردێ.[1]

## بۆ ئەوەی نەناردووم:

ئیبن عەباس دەڵێت: وەختێک زانایانی جولەکەو گاورەکانی نەجران لای پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - کۆبووبوونەوە و ئەویش بانگی دەکرد بۆ سەر ئیسلام ئەبورافیعی قەرەزی وتی: ئەی موحەممەد دەتەوێت وەک چۆن گاورەکان عیسا دەپەرستن، ئێمەش بەو شێوەیە تۆ بپەرستین؟ کەسێکی گاوری نەجرانیش کە پێی دەوترا رەئیس وتی: ئەی موحەممەد ئەوەت دەوێت لێمان؟ بۆ ئەوە بانگمان دەکەیت؟ جا پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: پەنا بەخوا، ئەگەر جگە لە خودا بپەرستین، یان داوای پەرستنی جگە لە ئەو بکەین، خودا بۆ ئەوەی نەناردووم، بەوەش فەرمانی پێ نەکردوم، یان شتێکی وەهای فەرموو جا قورئان دابەزی: ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللَّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا عِبَادًا لِّي مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ

---

(١) أخرجه الترمذي في سننه في كتاب الذبائح أبواب التفسير القرآن باب ومن سورة فاتحة الكتاب، رقم ٢٩٩٤ وقال : حديث حسن غريب وقال الألباني: حديث حسن.

ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ۝٧٩ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ۝٨٠﴾ آل عمران: ٧٩ - ٨٠ [١] [٢].

## خاچێکی زێڕین:

**عەدی کوڕی حاتەم دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - خاچێکی زێڕینم لەملدا بوو، دەڵێت: بیستم دەیفەرموو: ﴿ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ التوبة: ٣١ [٢] دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان نەیاندەپەرستن، فەرمووی: با، ئەوانەیان بۆ حەڵاڵ دەکردن کە خودا حەرامی کردبوو، ئەوانیش بە حەڵاڵیان دادەنا، ئەوانەی کە خودا لەسەریانی حەڵاڵ کردبوون ئەوان لێیان حەرام دەکردن، ئەوانیش لەسەر خۆیان حەرام دەکرد، ئەمە پەرستشەکەیانە بۆیان.[٤]**

## ئەی خوشکی هارون:

**موغەیرەی کوڕی شوعبە دەڵێت: وەختێک چووم بۆ نەجران، پرسیاریان لێکردم، ئێوە قورئان دەخوێننەوە: (یا أخت هارون)، موساش ئەوەندە و ئەوەندە پێش عیسا بووە؟ منیش**

---

(١) آل عمران : ٧٩- ٨٠. واتە: بۆ هیچ ئادەمیزاد و کەسێک نەگونجاوە کە خوا کتێبی ئاسمانی و فەرمانڕەوایی و پێغەمبەرایەتی پێببەخشێت، لەوەودوا بەخەڵکی بڵێت: وەرن ببنە عەبد و بەندەی من لە جیاتی ئەوەی بەندە و عەبدی خوا بن، بەڵکو (بەخەڵکیان وتووە) هەوڵ بدەن بۆ خوا بژین و لێبڕاو بن، بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار هەوڵ بدەن، بەوەش دەبنە خواناس و ڕەبانی کە بەرنامەی خوا فێری خەڵکی بکەن و خۆشتان بەردەوام هەوڵ بدەن فێری بن. (٧٩) (هیچ پێغەمبەرێک) فرمانی ئەوەی نەداوە کە فریشتەکان و پێغەمبەران بکەن بە پەروەردگار (هەرگیز کاری لەو جۆرە لەوان ناوەشێتەوە) ئایا ڕاستە فرمانی بێ باوەڕیی و کوفرتان پێ بدات دوای ئەوەی کە ئێوە موسڵمانن و ملکەچی پەروەردگارن؟!

(٢) أخرجه الطبري في كامع البيان في تفسير القرآن في تفسير سورة آل عمران برقم ١٦٥١ واشار أحمد شاكر الى صحته.

(٣) التوبة، ٣١. واتە، )گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن.(

(٤) أخرجه البيهقي في سنن الكبرى، كتاب آداب القاضي برقم ١٨٩٥٤ واورد الالباني نحو في غاية المرام وقال: حديث حسن.

کە گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ پرسیاری ئەوەم لێکرد، فەرمووی: ئەوان بەناو پێغەمبەر و پیاوچاکانیانەوە یەکتریان ناولێدەنا.[1]

## مرواریەکی درەخشانی مرواریەکانی گفتوگۆ:

## چاویان پڕبوو لە فرمێسک:

ئەبو ئیسحاق دەڵێت: بیست پیاوی گاور یان نزیک لەوە کاتێک هەواڵی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە حەبەشە بڵاوبووەوە هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ کە لەمەککە بوو، دەبینن لە مەجلیسێکدایە، قسەیان لەگەڵ کردو پرسیاریان لێکرد، پیاوانی قورەیش لە یانەکەی خۆیاندا بوون لە دەوری کەعبەدا، جا کاتێک ئەو پرسیارانەی کە دەیانویست و کردیان لە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لێ بوونەوە لە دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ بانگی کردن بۆ لای خوای گەورە و قورئانی بەسەردا خوێندن، کە قورئانەکەیان بیست، چاویان پڕ بوو لە فرمێسک، پاشان وەڵامیان دایەوە و باوەڕیان پێ کرد و ڕاساندیان، ئەو نیشانەنیان بینی کە تیایدا بوو کە لە کتێبەکەیاندا باسکرابوو، جا کاتێک هەستان ئەبوجەهل و کۆمەڵێک قورەیشی ڕێگەیان پێگرتن و وتیان: دەک خوا داتانوەشێنێت چۆن خەڵکێکن، ئێوە نێردراون لەلایەن هاودینەکانتانەوە تا هەواڵی ئەم کابرایە بزانن، کەچی لە مەجلیسەکەیدا ئۆقرەتان نەگرت هەتا وازتان لە دینەکەی خۆتان هێنا و باوەڕتان بە قسەکانیان کرد کە پێی وتن، هیچ خەڵکێک هێندەی ئێوە بەبێ عەقڵ نازانین، یان شتێکی وەهایان پێ وتن، بەڵام ئەوان پێیان وتن سەلامتان لێ بێت ئێمە بەو نەزانییەی ئێوە وەڵامتان نادەینەوە، ئیشی خۆمان بۆ خۆمان و ئیشی خۆتان بۆ خۆتان، ئێمە ئەو خێرە لەدەست خۆمان دەرناکەین، دەشوترێت ئەم گاورانە نەجرانی بوون خوداش دەزانێت کامیان بوون.[2]

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الادب ٤٠٩٤.

(٢) أخرجه البيهقي في دلائل النبوه، باب الهجره الاولى الى الحبشه برقم ٥٩٤.



## خواستی سێهەم

## بە پوختی

گاورەکان لە دورگەی عەرەبیدا کەمێکی زۆر کەمبوون، کە گاورەکانی نەجران بوون، ئەوان سەردانی پێغەمبەریانکرد، چوونە ناو مزگەوتەکەی، کاتی نوێژ هات و نوێژیان تێدا کرد، بانگی کردن بۆ ئیسلام رازیی نەبوون، راستیشیان بۆ دەرکەوت کەچی لەسەر گومڕایی خۆیان هەر سوور بوون، نیشانەکانی پێغەمبەرایەتییان تێدا دۆزیەوە کە لە تەورات و ئینجیلدا باسکراون، بۆیە کاتێک بانگی کردن بۆ ئەوە لەعنەتکردن بگۆڕنەوە ، نەیانکرد، ترسان کە لەعنەتی خوا بیانگرێتەوە، کە راوێژیان لەسەر لەعنەتگۆڕینەوە کرد لەناوخۆیاندا وتیان: ئەگەر بیکەین هەرگیز قوتارمان نابێت، بۆیە بە جزیە رازیی بوون و تەسلیمبوونیان قبوڵ کرد، داوایان لە پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ کرد کە پیاوێکی ئەمینیان بۆ بنێرێت، لەو وەختەدا شکۆ و رێزی ئەبوعوبەیدەی جەڕاح دەرکەوت، کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ـ دووردی خوای لەسەر ـ هەموو حەزیان بەو شەرەف پێبەخشینە دەکرد، بەڵام پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ تایبەتی کرد بە ئەبوعوبەیدەوە و ئەوی دیاری کرد، کە لە دواییشدا لای بەشێکی گاورەکانی نەجران مەیلی پەیمانشکاندن و هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکە پەیدا دەبێت، پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ ئامۆژگاریکارێکیان بۆ لا دەنێرێت تا ترسی خوداو ترسناکی پەیمان و رێککەوتن شکاندنیان بیربخاتەوە بەو شێوە ئاژاوەکە دەکوژێتەوە، لە کۆتاییشدا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ داوای پاککردنەوەی دوورگەی عەرەبی دەکات لە گاور و جولەکە، ئەمڕۆش بە روونی حیکمەتی ئەو بارکردن و زەرورەتی ئەو ڕاسپاردانە دەردەکەوێت، دەبینین سەرجەم سەرزەوی ئیسلام موسڵمانان و جگە لەوانیش تیایدا هاوبەشن، پێکەوە بە ئاشتی دەژین، مەگەر لەملاولا نەفام و نەزانێک ئاژاوەیەک هەڵگیرسێنن، بەڵام بەرزایی و قەڵاکەی ئاین و دەستپێکی بانگەواز و سەرچاوەی نیگا و تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەزاران جار سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئیسلامی هێشتووەتەوە و ئاینی پاراستووە لەم وڵاتەدا.

## باسی سێهەم

# گفتوگۆی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ سەرکردەکانی دنیادا



هیرەقل سەرگەورەکانی رۆمی لە هۆڵێکدا لە حیمس کۆکردەوە و فەرمانیکرد دەرگاکانیان لەسەر داخستن، پاشان خۆی دەرخست، وتی: ئەی خەڵکی رۆم، ئایا پێتان باشە سەربەرز و بەهرەمەند بن و دەسەڵاتەکەشتان بەرقەرار بێت؟ دەی شوێنی ئەو پێغەمبەرە بکەون، ئەوانیش وەک کەرەوەحشی کەوتنە هەراو هەڵهاتن بەرەو دەرگا کان، دەبینن داخراون، کە هیرەقل ئەو نارازیەیانی بینی و نائومێد بوو لە باوەڕهێنانیان، وتی: بیانگەڕێنەوە بۆ لام .



## خواستی یەکەم

# ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەش بۆ گفتوگۆ

### ڕێخۆشکردن:

دەکرێت مرۆ ئەم چەرخە بە چەرخی نزیکبوونەوە و پێکەوەژیان و پێکەوە گوتووبێژ بزانێت، چل ساڵێک بەر لە ئێستا پرۆفیسۆر مارشاڵ ماکلوهان تا ئەندازەیەکی باش ئەم پێشبینییەی کرد، لەڕاستییدا ڕەوڕەوەی تەکنەلۆژیا خێراتریش لەوەی ئەو بلیمەتە جیهانییە خەیاڵی بۆ دەکرد هەنگاوی بڕی.

کێ چەند دەیەیەک بەر لە ئەمڕۆ بە بیریدا دەهات تۆڕی زانیاری جیهانی (ئینتەرنێت) بەم شێوەیە جیهان پێکەوە ببەستێتەوە، ئیتر بە گواستنەوەی خێرای زانیاری بێت، یان بە گفتوگۆی مرۆڤەکان لەمپەڕەوپەڕی دنیاوە، بە ئازادی و بە نرخێکی کەم، ئەمانە جگە لە هۆکارەکانی دیکەی گەیاندن و ئاسانکاری سەفەر و گواستنەوە و ئاڵوگۆڕی بازرگانی و چەندین ڕێگەی دیکە کە ناژمێردرێن لەناو گەلاندا.

## هۆیەکانی گەیاندن و گفتوگۆ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ـ دروودی خوای لەسەر ـ

دەڵێم هەرچەندە ئەمڕۆ دۆخەکە ئاوهایە، بەڵام هۆیەکانی گەیاندن لە سەردەمی پێغەمبەردا کە خەڵکی لەسەری ڕاهاتبوون تەواو جیاواز بوون، هۆکارگەلێکی سادەبوون، ئەو کاتە نەریتی پاشا و سەرکردە و سەرۆکەکانی خەلک نامە گۆڕینەوە و وەڵام وەرگرتن و وەڵامدانەوە بوو، بۆ گەیاندنی ئەم ئەرکەش خەڵکی خانەدان و ژیر و وریایان دەکردە نوێنەری خۆیان و مۆریان بەکاردەهێنا، پێغەمبەری خوداش ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ مۆرێکی دروست کردبوو لەسەری نووسرابوو (الله) و لە ناوەڕاستەوە (رسول) و لە خوارەوەش (محمد)، ئەمەش وەک ئەدەبێک بەرامبەر پەروەردگاری، بەم مۆر دروستکردنەش دەیویست هاوشێوە و هاوشانی خەڵک و میللەتان بێت.

خۆنەگەر ئەم نامە و نامەکاریە کاتی زۆر و ڕێگای دور و نارەحەتی قورسی دەویست، بەڵام زەرورەتی ئەو سەردەمە بوو، سەیر لەوەدایە تا ئەمڕۆش کە لە سەردەمی تەکنەلۆژیا و شۆڕشی گەیاندندا دەژین، کەچی هێشتا زۆر لە پاشا و سەرۆکەکان ئەم شێوەی نامە ناردنە پەیڕەو دەکەن، دەبینین نامەیەکی دەستنووس بە ڕێگەی باڵیۆز یان وەزیرێکەوە دەنێرن بۆ یەکتری بە دەستی و مۆری تایبەتی لێدەدەن، چونکە نهێنی پاراستنی تێدایە و دەشپارێزرێت لەو چاوانەی کە دوژمنن و بۆی لە کەمینان.

## نامە گۆڕینەوە ڕێگایەکی گفتوگۆیە:

چونکە گفتوگۆی بەرەوڕوو کۆبوونەوە و یەکتردواندنی ڕاستەوخۆ ئاسان نییە، بۆیە زیاتر لەبری کۆبوونەوە و بەیەکگەیشتن نوینەر و نامەیان بەکاردەهێنا، لەسەر کۆمەڵێک بنەمای ڕێزگرتنیش لە نوینەران ڕاهاتبوون و لەسەری دەڕۆیشتن.

## عەرەب لە پەراوێز شارستانییەتدا:

لەڕاستییدا عەرەب گەلێکی جێگەی بایەخ نەبوون، ئەوان لە پەراوێزی مێژوودا دەژیان و لە دەرەوەی سنووری کاریگەریی بون لەسەر سیاسەتی ئەو سەردەمەی دنیا، ئەوان جارێک شوێنکەوتەی ڕۆم و جارێکیش شوێنکەوتەی فارس بوون، بەپێی نزیکی و تێکەڵی بازرگانییان لەگەڵ ئەو دوو هێزە زەبەلاحەدا.

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

هەر بەو بۆنەیەوە دەبێ بوترێت پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - و شەریعەتی ئیسلامیش هەڵوێستی روونیان هەیە و جیاوازییان کردووە لە نێوان ئەهلی کیتاب و بتپەرستاندا، لە قورئانی پیرۆزدا ئەو جیاکارییە روونە، چونکە ئەوان شوێنکەوتەی پێغەمبەرانن و خاوەنی گەلی پەیامدارن، بۆیە دەبینی ئیسلام ڕێگری لە موسڵمانان دەکات بتپەرستێک بخوازێت و خواردنی سەربڕاویشیانی قەدەغە کردووە، بەڵام گاور و جولەکەی

لێ جیاکردووەتەوە، ﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ المائدة: ٥ [١].

## خۆشەویستی نزیکترە:

**موسڵمانان مەیلێکی دەروونییان لەگەڵ گەلی رۆمدا هەبووە و فەزڵیان داون بەسەر هاوبەشدانەرەکاندا، نەک تەنها لە بواری مۆڵەتپێدانی ژنلێخواستنیان و خواردنی سەربڕاویان، بەڵکو لە بواری هەست و سۆزیشدا، بەڵگەش بۆ ئەوە ئەو خەم و خەفەتە بوو کە پێغەمبەری خودا و هاوەڵانی گرتەوە کاتێک ئەم ئایەتانە دابەزین:** ﴿الٓمٓ ١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ٣﴾ الروم: ١ - ٢ [٢].

## هێزە زەبەلاحەکان:

**پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ ئاگاداری رووداوەکان و کاریگەری دوو دەوڵەتە گەورەکەی دراوسێی لەسەر دەوڵەتە کۆرپەکەی خۆی لە دورگەی عەرەبی بوو، بۆیە لەگەڵ ئەم دوو دەوڵەتە و هێزەکانی دیکەی ناوچەکە و پارێزانە کاریگەرەکانی کاروانی شارستانی مرۆڤایەتی گفتوگۆی بە شێوازێکی نوێ کردەوە کە گفتوگۆی بەو شێوە لەناو پاشا و**

---

(١) المائدة : ٥. واتە: لەمرۆوە هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵ کراوە و خواردنی ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، ئافرەتانی داوێن پاک لە ئیمانداران و ئافرەتانی داوێن پاک لەوانەی کتێبیان پێدراوە پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە) کاتێک مارەییان پێبدەن، بەمەرجێک ئێوە پاک داوێن بن و داوێن پیس نەبن بەئاشکراو دوورە پەرێز بن لە دۆست گرتنی نهێنی بۆ داوێن پیسی، جا ئەوەی بێ باوەڕ بێت بەشەرعی خواو لەم حەرامانە خۆی نەپارێزێت، ئەوە ئیتر کارو کردەوە چاکەکانیشی پووچ دەبێتەوە و ئەو جۆرە کەسانە لە قیامەتدا لە ریزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندو دۆڕاوەکاندان.

(٢) الروم ١- ٣. واتە: چەند پیتێك لە سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون ژمارەیان (١٤) پیتە، نموەی کۆی پیتەکانی زمانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی (اعجاز) و مەزنی و گرنگی قورئان کە لە توانای هیچ کەسدا نیە بەو پیتانە کتێبێکی ئاوا بێ وێنە دابنێت، بەرادەیەك هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەو مەبەستە بێگومان ناتوانن، هەروەها چەندەها نهێنی تریشی تێدایە، زاناکان لە هەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتوویانە: هەر خوا خۆی زانایە بە نهێنی ئەو پیتانە. رۆمەکان تێکشکێنران (بەدەستی فارسەکان). (٢) لە نزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئایندەدا (نۆرەیان دێتەوە) رۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە.

سەرۆکەکانی ئەو سەردەمەدا باو نەبوو، رەنگە پاشاکان لەگەڵ یەکدی نامەیان گۆڕیبێتەوە و داوای ئاشتەواییەکیان کردبێت، یان نارەزاییان بەرامبەر دوژمنکارییەک دەربڕیبێت، یاخود هەڕەشەی هەڵگیرساندنی جەنگیان کردبێت، یان داوای نزیکبوونەوەیان کردبێت، بەڵام ئەم شێوە گفتوگۆ شارستانیەتەی کە پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - دایهێنا، پێشتر کەس نەیبینیبو، ئەو گفتوگۆ و دواندنی بۆ گەیاندن و بڵاوبوونەوەی بانگەواز دەستپێکرد، بەهۆی نامەگۆڕینەوەوە کە ئەمە شێوازێکی نوێی نێوان گەل و نەتەوەکان بوو.





## خواستی دووهەم

# چەند نموونەیەک لە گفتوگۆکانی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ سەرکردەکانی جیهاندا

### لەناکاو

هێرقل (Hercules) پاڵەوانێکی دیار و سەرکردەیەکی ناسراوی مەسیحییەکانە، لەگەڵ ئەوەی سەرکردەیەکی بلیمەت بووە، یەکێکیش بووە لە شارەزایانی کتێبی پیرۆز، پێدەچێت نەریتی مەسیحییەکان بێت کە پاشای لەو شێوە هەڵبژێرن، یان لەو سەردەمەدا سەرکردەکان دەبوو شارەزای کتێبی پیرۆز و مێژووی ئایینەکەیان بن، ئەمەش لە پرسوڕای هیرقلدا لەگەڵ قەشەکاندا دەردەکەوێت لە هەموو شتێکی بایەخداردا، چونکە دەسەڵاتی کەنیسە بەسەر دەوڵەتدا لەو سەردەمەدا زۆر زاڵ و بەهێز بوو، کاریگەرترین هێز بوو بەسەر بزووتنەوەی کۆمەڵگەدا، بەهۆی تووڕەبوون و ڕەزامەندی کەنیسەوە دەسەڵاتدار لادەبرا و دادەنرا، هیرقلیش لەبەرئەوەی سەرکردەیەکی مەزن و زانایەکی گەورەی کتێبی پیرۆز بوو، خۆیشی و دەوڵەتەکەشی بەرامبەرێکی سەرسەختی دەوڵەتی فارس بوون، لەو سەردەمەشدا جیهان بەسەر ئەم دوو جەمسەرەدا دابەش بووبوون و ململانێیان دەکرد، ئەم گفتوگۆیەی ئەوڕۆ هەیە لە بەستنی کۆنگرە و کۆبوونەوەی درێژخایەن لەو سەردەمەدا بوونی نەبوو، بۆیە ڕێگای گفتوگۆ سەخت و دژواربوو، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ نامە گۆڕینەوەی کردە هۆکاری وتووێژ و گفتوگۆ.

## بنەمای نامەکان و هێڵە گشتییەکانیان:

ئەوکات نامە زۆر بە کورتی و وردی دەنووسرا، بەهێزترین تایبەتمەندیشی ئەوەبوو دەرفەتی بە لایەنەکەی دیکە دەدا، مافی ئەوەشی پێدەدا ناوەڕۆکەکەی قبوڵ بکات یان ڕەتی بکاتەوە، پابەندیشی دەکرد بەوەی هەڵوێستی خۆی لێ دەرببڕێت و وەڵامی پەیامبەرەکەی بداتەوە، ئەمەش شێوەیەک بوو لە شێوەی کۆنگرە شارستانییەکان کە ئەمڕۆ خەڵک وتوێژی تێدا دەکەن، بەشێوازێک لەگەڵ سەردەم بگونجێت و لەگەڵ ڕووداوەکان بێتەوە، چونکە

ئەوکات کۆکردنەوەی خەڵکی دوورلەیەک لە هۆڵێکدا وەک ئەمڕۆ ئەستەم بوو، لەبەر دووری و نارەحەتی و مەترسییەکانی ڕێگا.

بۆیە نامە دەنووسرا و پەیامبەر دەنێررا بۆ سەرخستنی و گەشتنە ئەنجامی ئەو گفتوگۆ شارستانیانە، بۆ ئەم ئەرکەش پەیامبەری تایبەت هەڵدەبژێردرا.

## کەسێتی نێرراوەکان:

هەرچەندە هەموو ئەو نێردراوانەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەیناردن بۆ لای پاشاو سەرکردەکان کەسانێکی وریاو لێزان و روخسار جوان بوون، بەڵام هیچ کەسیان لە دوحیەی کەلەبی قەشەنگتر نەبوو، ئەویان بە جوبرەئیل دەشووبهاند، جوبرەئیلیش لە شێوەی ئەودا دەهات بۆ لای پێغەمبەر ـ درەوودی خوای لەسەر ـ ئەوەتا ئوم سەلەمە دەگێڕێتەوە: (پێغەمبەری خوا ـ درەوودی خوای لەسەر ـ قسەی لەگەڵ پیاوێک دەکرد، کاتێک هەستا، فەرمووی: ئوم سەلەمە ئەوە کێ بوو؟ وتم: دوحیەی کەلەبی بوو، نەمزانی جوبرەئیل بوو، تا گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ـ درەوودی خوای لەسەر ـ ئەو قسانەی نێوانمانی بۆ هاوەڵان دەگێڕایەوە).[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش دەڵێت: جوبرەئیل لە شێوەی دوحیەی کەلەبیدا دەهات بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ درەوودی خوای لەسەر ـ.[2]

## سودێک لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ـ درەوودی خوای لەسەر ـ

لەوەی کە جوبرەئیل لەسەر شێوەی دوحیە دەهاتە لای پێغەمبەر ـ درەوودی خوای لەسەر ـ ئەو سوودەی لێوەردەگیرێت کە دروستە رەچاوی روخسارجوانی بکرێت لە دەستنیشانکردنی نێردراو و پەیامبەردا، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوداش ـ درەوودی

(١) أخرجه أبو يعلي الموصلي في مسنده برقم ٦٧٦٠ وأخرجه بألفاظ متقاربة الطبراني في معجمع الكبير رقم ١٨٦٩٤.

(٢) أخرجه ابن سعد في الطبقات الكبرى برقم ٥١١٤ وابن حجر العسقلاني في الاصابه ٤٧٣/١. واسناده صحيح.

خوای لەسەر ـ پشتیوانی دەکات (پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە ئەمیرەکانی دەفەرموو: ئەگەر نێردراوێکتان نارد، کەسێکی روخسارجوان و ناوجوان بنێرن).[1]

## دوحیە بۆ؟

هەڵبژاردنی دوحیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ـ دروودی خوای لەسەر ـ بۆ ناردنی بۆ لای گەلێک کە لە هەموو گەلان کاریگەریی زیاتر بوو لەسەر شارستانیەتی مرۆڤایەتی لەو رۆژگارەدا، هەڵچوونێکی سیاسی و بێبەرنامەیی نەبوو، بەڵکو ئەمە مانای ریشەدار و قووڵی هەیە، چونکە مرۆڤ بەگشتی بە روخساری شیرین و بەژنی رێکوپێک کاریگەر دەبێت، بەتایبەت رۆمەکان، بایەخی زۆریان بە رواڵەت و جوانی دەدا، بۆیە ناردنی دوحیەی شۆخ و شەنگ بە ناوو ناوەرۆکەوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ـ دروودی خوای لەسەر ـ پەرۆشی هیدایەتدان و قبوڵکردنی بانگەواز دەردەخات.

## سیفەتەکانی نێردراو:

وا دیارە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ کە نێردراوێکی دەست نیشان و دیاریی دەکرد، کەسانێک بوون لەناو هاوەڵانیدا حیکمەت و وریایی و ئازایەتی تێدا بەدی دەکرا، بەڵام کە ویستی نێردراو بنێرێ بۆ لای هیرەقل، بابەتەکەی خستە بەردەم هاوەڵان و باسی پاداشتی گەورەشی کرد بۆ ئەو کەسەی ئەم ئەرکە بایەخدارە مەزنە لە ئەستۆ بگرێت، چونکە گەلی رۆم نزیکترین گەلان بوون لە موسڵمانانەوە: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانًا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۝ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ۝ وَمَا لَنَا لَا نُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡحَقِّ

(١) أخرجه ابن أبي شيبه في مصنفه كتاب الجهاد برقم ٣٢٣٦٣.

وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾﴾ المائدة: ٨٢ – ٨٥ .[1]

**ئەمەش لەبەر ئەو زانستەی هەیانە و ئەو کتێبەی کە لە عیسای کوڕی مەریەمەوە بۆیان ماوەتەوە، لەبەرئەوەش کە بەشێکیان بەرامبەر بانگەوازی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ نەرمیان نواندو بەشێکیشیان هاتنە نێو ئیسلامەوە.**

## زانا و سەری گاورەکان لە حەبەشە:

**ئەو نەرمونیانیەی لە نەجاشی سەری مەسیحییەکانی حەبەشە لە سەردەمی خۆیدا و شارەزا لە کتێبی پیرۆز و هەڵکەوتوی مەملەکەتی روویدا، بۆ کەسانێک حەقیقەتی مەسیحییەکان و دڵنەرمییان نەزانن جێگەی پرسیارە!**

## پرسەی نەجاشی:

**ئەبوهورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ هەواڵی مردنی نەجاشی دەسەڵاتداری حەبەشەی پێراگەیاندین، لەو رۆژەدا کە تیایدا مرد، فەرمووی: داوای**

(١) المائدة ؛ ٨٢ـ ٨٥. واتە: سوێند بەخوا دەبینیت و دەستت دەکەوێت سەر سەختربنی خەڵک لە دوژمنایەتیدا بەرامبەر بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، جولەکەن و ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خوا داناوە و سوێند بێت دەبینیت و دەستت دەکەوێت نزیکترینیان لە سۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەوانەن کە دەیانوت: بەڕاستی ئێمە نەصرانین، ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەندێک لەوان قەشەی دیندارن و هەندێکیشیان گۆشەگیرو کەسانی خواپەرستن و بێگومان ئەوان خۆ بەگەورە دانانێن. (٨٢) (ئەوانەیان کە بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕێن) هەر کاتێک گوێیان لە قورئان دەبوو کە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیووە، دەبینیت چاوەکانیان ئەسرینی خۆشی هەڵدەڕژێنێت، بەهۆی ئەو حەق و ڕاستیەی کە دەیانناسی، لەکاتێکدا دەڵێن: پەروەردگارا ئێمە ئیمان و باوەڕمان هێناوە (بە ئاینی ئیسلام) دە تۆش لە ڕیزی (پەیڕەوان) و شایەتەکاندا تۆمارمان بکە. (٨٣) چی ڕێمان لێدەگرێت باوەڕ نەهێنین بە خواو بەوەی بۆمان هاتووە لە حەق و ڕاستی، هیواداریشین کە پەروەردگارمان بمانخاتە نێو ڕیزی چاکان و گونجاوان بۆ خواپەرستی. (٨٤) جا بەهۆی ئەوگوفتارە بەجێیەیان پاداشتی دانەوە، بەوەی باخەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا، هەر بەو شێوەیەشە پاداشتی چاکەکاران.

لێخۆشبوون بکەن بۆ براکەتان.[1]

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: ڕۆشتە نوێژگە و هاوەڵانی ڕیزکرد و چوار ئەڵاهو ئەکبەری کرد.[2]

## هاوپەیمانی نێوان شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (علیهما السلام):

ڕەنگە پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - ئومێدی بە موسڵمان بوونی هیرەقل هەبووبێت، چونکە ئەگەر ئەوە ڕوویدابا سەرکەوتنێکی مەزن و دەستکەوتێکی گەورە دەبوو، هاوپەیمانیەتیەکی بەهێز دروست دەبوو لە نێوان دەوڵەتێکی گەنجی تازە کە دوا بڵێسەی ڕووناکی ئاسمانی هەڵگرتبوو لەگەڵ دەوڵەتێکی بەهێز و گەلێکی گەورەدا، ئەو باوەڕەیان بە بانگەوازەکەی موحەممەدی دوا پێغەمبەر هێنابا، ئەو هاوپەیمانیەتیە ئاییندەیەکی مەزن و ڕووناکییەکی فراوان چاوەڕوانی بوو، ئاگری بتپەرستیان دەکوژاندەوە و بریقەی بڵێسەی ئاگرپەرستییان تەفروتوونا دەکرد، کە ئەو سەردەمە گەلێکی توند و بەهێز و دەوڵەتێکی یاخی (فارسی) فەرماندەییان دەکرد.

## بانگەواز بۆ ئەرکێکی مەزن:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: کێ ئەم نامەیەم دەبات بۆ لای قەیسەر بەهەشت بۆ ئەو بێت، کابرایەک لە ناو خەڵکەکە وتی: ئەگەر نەشکوژرێت؟ فەرمووی: ئەگەر نەشکوژرێت، ئەو کابرایە نامەکەی برد و لە ڕێگەی (بیت المقدس) گەیشتە قەیسەر.[3]

وەک گێڕانەوەکان بەگشتی دەریدەخەن کابرا دوحیەی کەلەبی بوو.

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح كتاب الجنائز برقم ١٢٧٦.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح كتاب الجنائز برقم ١٢٠٠.

(٣) أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب السير برقم ٤٥٧٥ وقال الألباني في صحيح المراد صحيح ١٣٥١.

## نامەکەی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بۆ هیرەقل:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ نامەی نووسی بۆ قەیسەر و بانگی کرد بۆ ناو ئیسلام، نامەکەی بە دوحیەی کەلەبیدا نارد، فەرمانی پێکرد بیدات بە گەورەی بوسرا تا ئەویش بیگەیەنێتە قەیسەر، قەیسەریش دوای ئەوەی سوپای فارسی تێکشکاند، لەوکاتەدا لە حیمسەوە بەپێ دەچوو بۆ سوپاسگوزاری پەروەردگار بۆ ئیلیا، جا کاتێک نامەکەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ گەشتە قەیسەر و خوێندیەوە وتی: کەسێکم لێرە لە خزمانی بۆ بدۆزنەوە تا پرسیاری ئەم پێغەمبەرەی لێ بکەم.

## عەرەبەکان لە مەجلیسی هیرەقلدا:

ئیبن عەباس دەڵێت: ئەبو سوفیان پێی راگەیاندم: خەڵکێکی قورەیشی ئەوکاتە بۆ بازرگانی هاتبوونە شام، لەو ماوەی کە پەیماننامە لەنێوان پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ کافرانی قورەیشدا هەبوو، ئەبو سوفیان دەڵێت: لای شام گەشتینە قەیسەر، ئەویش من و هاوڕێکانمی لەگەڵ خۆی برد تا گەشتینە ئیلیا، لەوێ چووینە ژوورەوە بۆ لای، دەبینین لە مەجلیسی پاشایەتیدا دانیشتوە و تاجی لەسەرە و مەزنەکانی رۆم لە دەوروبەری دانیشتوون.

## دە پرسیارەکەی هیرەقل:

هیرەقل دەستی دایە پرسیارکردن لە ئەبوسوفیان:

- هیرەقل: نەژاد و بنەماڵەی لە ناوتاندا چۆنە؟
- ئەبوسوفیان: خاوەنی نەژاد و بنەماڵەیە لە ناوماندا.
- هیرەقل: ئایا کەسێکی تر لە پێشی ئەمەوە ئەم قسەیەی کردووە؟
- ئەبوسوفیان: نەخێر
- هیرەقل: ئایا لە باوباپیرانیدا کەسیان خاوەنی دەسەڵات بووە؟
- ئەبوسوفیان: نەخێر.

• هیرەقل: ئایا پیاوماقوڵان شوێنی کەوتوون یان لاوازەکان؟
• ئەبوسوفیان: لاوازەکان.
• هیرەقل: ئایا زیاد ئەکەن یان کەم؟
• ئەبوسوفیان: زیاد ئەکەن.
• هیرەقل: ئایا کەس هەیە دوای موسڵمان بوون پشت لە دینەکەی بکات و هەڵبگەڕێتەوە؟
• ئەبوسوفیان: نەخێر.
• هیرەقل: ئایا پێش ئەمەی کە ئەیڵێ درۆتان لێ ئەبیست؟
• ئەبوسوفیان: نەخێر.
• هیرەقل: ئایا غەدر ئەکات؟
• ئەبوسوفیان: نەخێر، ئێستە پەیمانمان لە نێواندایە نازانین چی تیا ئەکات.
• هیرەقل: ئایا جەنگتان لەگەڵدا کردووە؟
• ئەبوسوفیان: بەڵێ.
• هیرەقل: ئەنجامی جەنگەکەتان چۆنە؟
• ئەبوسوفیان: جەنگ لە نێوانماندا بە نۆرەیە، دەستمان لێ ئەوەشێنێ و دەستی لێ ئەوەشێنین.
• هیرەقل: چ فەرمانێکتان بەسەردا ئەدات؟
• ئەبوسوفیان: ئەڵێت: خوا بە تاک و تەنیا بپەرستن و هیچ شتێک مەکەنە هاوتای و واز لە بیروبۆچوونی باوباپیرانتان بهێنن و فەرمانمان بەسەردا ئەدا کە نوێژ بکەین و راستگۆ و پاک داوێن بین و سیلەی رەحم بەجێ بهێنین.

## ئەنجامگیریەکانی هیرەقل لە وتووێژەکە:

کە ئەم قسانەمکرد هیرەقل بە تەرجومانەکەی وت: پێی بڵێ من پرسیاری بنەماڵە و نەژادیم لێکردی، تۆ ئەوەت باس کرد کە خاوەنی نەژادە لە ناوتاندا، پێغەمبەرانیش لە ناو قەومەکانیاندا خاوەنی نەژادن.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا لەوەوپێش کەسێکی تر ئەم قسەیەی کردووە؟ وتت: نەخێر، وتم: ئەگەر کەسێکی تر لەوەوپێش ئەمەی وتبێ، ئەوا ئەموت: کابرا شوێن وتەی پێشووەکەی کەوتووە.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا لە باوباپیرانیدا کەسیان خاوەنی دەسەلات بووە؟ وتت: نەخێر، خۆئەگەر لە باوباپیرانیدا کەسیان دەسەلاتی بوایە، ئەوا ئەموت: کابرای داوای مولک و دەسەلاتی باوکی ئەکات.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا پێش ئەمەی کە ئەیڵێت درۆتان لێ ئەبیست؟ وتت: نەخێر، دەی ئەوە ئەزانم کە ناگونجێ کەسێ لەگەڵ خەڵکدا دەست لە درۆ هەڵبگرێ، کەچی لەگەڵ خوادا درۆ بکات.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا پیاوماقوڵان شوێنی کەوتوون یان لاوازەکان؟ وتت: لاوازەکان شوێنی کەوتوون، کە ئەوانیش شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانن.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا زیاد ئەکەن یان کەم؟ ئەوەت باس کرد کە زیاد ئەکەن، کاری ئیمانیش وەهایە هەتا تەواو ئەبێت.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا کەس هەیە دوای موسڵمان بوون پشت لە دینەکەی بکات و هەڵبگەڕێتەوە، وتت: نەخێر، ئیمانیش وەهایە کاتێ کە بە گەشاوەیی تێکەڵ بە دڵ ئەبێت.

پرسیاریشم لێ کردی: ئایا غەدر ئەکات؟ وتت: نەخێر، پێغەمبەرانیش غەدر ناکەن.

پرسیاریشم لێکردی: ئایا جەنگتان لەگەڵ کردووە و ئەو لەگەڵتان جەنگاوە وتت: بەڵێ جەنگ بووە، جەنگەکەش بە نۆرە بووە، جارێک ئێوە دەمانبردەوە و جارێک ئەو، پێغەمبەرانیش هەر بەو شێوەیەن تاقی دەکرێنەوە، بەڵام سەرکەوتن بۆ ئەوانە.

پرسیاریشم لێ کردی: چ فەرمانێکتان بەسەردا ئەدات؟ باسی ئەوەت کرد کە فەرمانتان بەسەردا ئەدات کە خوا بپەرستن و هیچ شتێک نەکەنە هاوەڵی و لە بتپەرستی قەدەغەتان ئەکات و فەرمان بە نوێژکردن و ڕاستگۆیی و پاک داوێنی ئەدات.

## هیرەقل و هیوای گەیشتنی بە دیداری موحەممەد :

وتی: جا ئەگەر ئەوەی تۆ ئەیلێیت ڕاست بێ، ئەوا زێر ئەم دوو پێیە ئەبێتە موڵکی ئەو، ئەشمزانی کە ڕەوانە ئەکرێ، بەڵام نەمئەزانی لەناو ئێوەدا هەڵئەکەوێ، خۆزگە ئەگەر بزانم ئەیگەمێ، ئەوا هەوڵم ئەدا بە خزمەتی بگەم و گەر لە خزمەتیشیا بوومایە ئەوا قاچەکانیم دەشت.

## دەقی نامەکەی پێغەمبەر بۆ هیرەقل:

ئەبو سوفیان دەڵێت: پاشان فەرمانی دا نووسراوەکەی پێغەمبەری خوایان هێناو بۆ ئامادەبووانیان خوێندەوە، کە بەم شێوەیە بوو: (بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد عبدالله ورسوله، إلى هرقل عظيم الروم، سلام على من اتبع الهدى، أما بعد.. فإني أدعوك بدعاية الإسلام، أسلم تسلم، يؤتك الله أجرك مرتين، فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين.[1]

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمران: ٦٤ .[2]

## قاڵە قاڵ و هەرای ناو مەجلیسەکەی هیرەقل:

ئەبوسوفیان دەڵێت: دوای تەواوبوونی قسەکانی، دەنگی ناڕەزایی و بۆڵە بۆڵ بەرز بوویەوە، هیرەقلیش فەرمان ئەدات ئەبوسوفیان و هاوەڵانی بکرێنە دەرەوە.

---

(١) واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە محەمەدی بەندە و پێغەمبەری خواوە بۆ هیرەقل مەزنی ڕۆم، سڵاو لەوەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت، پاشان: من بانگت دەکەم بۆ هاتنە ناو ئیسلام، موسڵمانبە، سەلامەت دەبیت، خوداش دووجار پاداشتت دەداتەوە، خۆئەگەر پشتهەڵکەیت تاوانی ئەریسییەکانیشت دەکەوێتە سەر. (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ). آل عمران : ٦٤.

(٢) آل عمران : ٦٤.

ئەبوسوفیان ئەڵێت: کاری موحەممەد گەورە بووە، ئەوەتا پادشای ڕۆم لێی ئەترسێ..

دوایی ئەبوسوفیان ئەیوت: هەروا بە لامەوە یەقین بوو کە پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - سەرئەکەوێت، تا ئەوەبوو خوا ئیسلامی خستە دڵمەوە.[1]

## هیرەقل دان دەنێت بە ڕاستەقینەدا :

بوخاری لە ریواتەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد دەکات: (ئیبن ناتور کە گەورەی ئیلیا بوو لە شامدا لای هیرەقل دەڵێت: کە هیرەقل هات بۆ ئیلیا ڕۆژێک بە پەژارەیی خەبەری بوەوە، هیرەقل خۆی ئەستێرەناس بوو، کە پرسیاری پەژارەییەکەیان لێکرد، وتی: ئەمشەو کە سەیری ئەستێرەکانم کرد بینیم پاشایەکی خەتەنەکراو دەرکەوت، پێمبڵێن لەم خەڵکەدا کێن خەتەنە دەکەن؟ وتیان: جگە لە جولەکە کەس خەتەنە ناکات، ئەوانیشت بە لاوە گرنگ نەبێت، بنێرە بۆ شارەکانی ژێر دەسەڵاتت چی جولەکەی تێدایە بکوژرێن، هێشتا ئەوان لەو قسانەدا بوون، کابرایەک کە پاشای غەسان ناردبووی، هەواڵی پێغەمبەری خوای بۆ هیرەقل هێنا، کە هەواڵەکەیان پێدا، هیرەقل وتی: بڕۆن بزانن خەتەنەکراوە یان نا؟ سەیریان کرد خەتەنەکراوە، هیرەقل وتی: ئایا عەرەب خەتەنە دەکەن؟ وتی: بەڵێ خەتەنە دەکەن، جا هیرەقل وتی: ئەوا پاشای ئەم خەڵکە دەرکەوت، پاشان هیرەقل نامەی بۆ هاوەڵێکی لە (ڕۆما) نارد کە هاوشێوەی خۆی زانا بوو، خۆیشی گەڕایەوە بۆ حیمس، بەرلەوەی بگاتە حیمس وەڵامی نامەی هاوڕێکەی بۆ هاتەوە، کە هاوڕای هیرەقل بوو لە ڕاستێتی دەرکەوتنی پێغەمبەردا، جا هیرەقل سەرگەورەکانی ڕۆمی لە هۆڵێکدا لە حیمس کۆکردەوە و فەرمانیکرد دەرگاکانیان لەسەر داخستن، پاشان خۆی دەرخست، وتی: ئەی خەڵکی ڕۆم، ئایا پێتان باشە سەربەرز و بەهرەمەند بن و دەسەڵاتەکەشتان بەرقەرار بێت؟ دەی شوێنی ئەو پێغەمبەرە بکەون، ئەوانیش وەک کەرەوەحشی کەوتنە هەراو هەڵهاتن بەرەو دەرگاکان، دەبینن داخراون، کە هیرەقل ئەو نارازیەیانی بینی و نائومێد بوو لە باوەڕهێنانیان، وتی: بیانگەڕێنەوە بۆ لام، جا پێی وتن: ئەو قسەیەم بۆ تاقیکردنەوەی ئێوە

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الجهاد والسير، باب دعاء النبي ﷺ الناس إلى الإسلام والنبوة، برقم: ٢٨٠٦.

کرد، لەسەر پابەندی توندتان بە ئاینەکەتانەوە، ئەوا بینیم، ئەوانیش کڕنووشیان بۆ برد و پێی رازیبوون، ئەمە کۆتا هەوڵی هیرەقل بوو).[1]

## هیرەقل وەڵامی بانگهێشتەکەی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەداتەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیک لەبارەی قەیسەرەوە دەڵێت: نامەی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ کە من موسڵمانم و چەند دینارێکیشی بۆ نارد، بەڵام پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەو دوژمنەی خوا درۆ دەکات موسڵمان نەبووە و هەر لەسەر گاورێتیە، دینارەکانیشی دابەشکرد.[2]

## نموونەیەکی گفتوگۆ لە رێگای نامە گۆڕینەوەوە:

موحەممەدی کوڕی موسلیم دەڵێت: ئەو نامەی پێغەمبەری خودام خوێندەوە کە دای بە عەمری کوڕی حەزم کاتێک ناردی بۆ نەجران، نامەکە لای ئەبوبەکری کوڕی حەزم بوو، تیایدا هاتبوو: ئەمە روونکردنەوەیەکە لەلایەن خودا و پێغەمبەرەکەیەوە (یا أیها الذین آمنوا أوفوا بالعقود) جا چەند ئایەتێکی تری تێدا نووسرابوو تا گەیشتە (إن الله سریع الحساب).[3]



(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في باب بدء الوحي برقم: ٧، عن ابن عباس رضي الله عنهما.

(٢) أخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب السير، باب الخلافة والأمارة.

(٣) أخرجه الطبري في جامع البيان في تفسير سورة المائدة ـ القول في تأويل قوله تعالى: (يا أيها الذين آمنوا أوفوا بالعقود) برقم ٩٩٤٤ واشار أحمد شاكر في مقدمة عمدة التفسير ٦٢٠/١ إلى صحته.



## خواستی سێهەم
## بە پوختی

ئەزموونی نامە گۆڕینەوە لەگەڵ پاشا و سەرۆکەکاندا ئەزموونێکی دەوڵەمەندە، چونکە بانگەوازی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بانگەوازێکی جیهانییە خۆیشی پێغەمبەری خودای جیهانیانە بۆ هەموو مرۆڤەکان.

یەکێک لە مەوداکانی ئەم نامە گۆڕینەوەیە ئەوەیە خەڵک بزانن کە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ لەم بانگەوازەیدا مەرامی بەرژەوەندی شەخسی یان دەستکەوتی ماددی نەبوە، ئەگەر ئەوانەی مەبەستبا بەوەندە وازی دەهێنا کە دەسەڵاتی بەسەر دوورگەی عەرەبیدا گرت و بوو بە پێغەمبەری عەرەب و خزم و دۆست و خێڵەکەی.

مەدوایەکی دیکە ئەوەیە سەرکردەکانی پاش خۆی کە دێن بزانن هێشتا ئەرکەکان دواییان نەهاتووە، نابێت لە وڵاتێکدا راوەستن و لە شوێنێکدا لێی دانیشن، بەڵکو دەبێت کاروانی بانگەواز تەواو بکرێت و رووناکی خودایی بگاتە جیهانیان. ئەوانەش رامالرێن کە لەرێی بانگی حەق و هەڵگرانی مەشخەڵی رێنماییدا دەوەستنەوە.

مەودایەکی دیکەی ئەوەیە بەڵگەی خودای پەروەردگار بەسەر هەموو خەڵکەوە بێت، خۆ ئەگەر پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ لە رۆژی عەرەفە و حەجیماڵئاواییدا لە وتارەکەیدا ئەستۆپاکی خۆی راگەیاند کە ئەوەی لەسەری بووە گەیاندوویەتی و خەڵکەکەش شایەتیان بۆ داو ئەویش خودای کرد بە شایەت و فەرمووی: (**اللهم فاشهد**)، کەوا لەو رۆژەدا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە سنووری دورگەی عەرەبیدا ئەرکی گەیاندنی بانگەوازی بەجێهێنا، لە دوای ئەو رۆژەشەوە هەر شوێنێک لە دەرەوەی دوورگەی عەرەبی ناوی بیستبێت و هەر پاشایەک دەستی پێ گەیشتبێت، ئەو نامەی بۆ ناردووە و بانگی کردووە بۆ ئیسلام بەڵگەی خستووەتە سەری.

## باسی چوارەم

# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بکوژەکان و سەرانی تیرۆرستان



فوزالەی کوڕی عومەیری لەیسی دەڵێت: (ساڵی فەتحکردنی مەککە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە خەریکی تەوافکردن بوو بە دەوری کەعبەدا، دەمویست بیکوژم، کە لێوەی نزیکبوومەوە فەرمووی: ئەوە فوزالەی؟ وتم: بەڵێ، فوزالەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی: چیت لە دڵی خۆتدا دەوت: وتم: هیچ خەریکی یادی خودا بووم، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرمووی پێم: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە، پاشان دەستی خستە سەر سنگم).(سوێند بەخوا دەستی بەرزنەکردەوە تا بوو بە خۆشەویسترین دروستکراوی خودا لە دڵمدا)



# خواستی یەکەم

# ڕێخۆشکردن و زەمینەسازی هاوبەش بۆ گفتوگۆ

## ڕێخۆشکردن

عەرەب لە دوورگەی عەرەبیدا لەسەر شێوازێکی سیستەمی کۆمەڵایەتی ڕاهاتبوون، خەڵک بوبون بە دوو بەشەوە کە سێهەمیان نەبوو، گەورە و کۆیلە، ئاغا و خزمەتکار، جۆرە سیستەمێکی سیاسیشیان پێکهێنابو کە هەموان لەسەری ڕازیی بوون و لەگەڵ سیستەمی خێڵەکیدا پێکدەهات، هەندێک هۆز لەوانی دی قسەڕۆیشتووتر بوون، هەموو هۆزێکیش سەر و شان و پەلیان هەبوو، سەرۆک هۆز لەبری هەموان بوو، بەناویانەوە قسەی دەکرد و فەرمانی پێدەکردن و ئەوانیش پێچەوانەی نەدەبوونەوە و قسەیان نەدەشکاند، ئەو لای ئەوان بە گەورە و دادوەر و ڕاوێژکار دادەنرا، بەڵام کاتێک پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ نێردرا، دڵانی کەمەندکێش کرد، خەڵکە سادەکە و بەشێک لە گەورە و پیاوماقوڵانیش چوونە لای، بۆیە بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ تەنها بانگکردنی پەرستنی خودا نەبوو کە پەرستشی بتەکان بەتاڵ بکاتەوە، بەڵکو خۆری کەسایەتییەکە پرشنگی بەسەر ئەستێرەی گەورە و سەرۆک هۆزەکاندا دایەوە، بەشێکیانی کز کردو ڕۆشنایی زۆربەشیانی کوژاندەوە.

بۆیە یەکێکیان دەیوت: ئێمە و نەوەی عەبدولمەناف کێبرکێی شکۆمەندییمان کرد، تا وەک دوو ئەسپی پێشبڕکێ هاوشانی یەک بوینەوە، کەچی ئێستا ئەوان دەڵێن ئێمە پێغەمبەرمان لەناودا پەیدا بووە، ئەی ئێمە کەی پێی دەگەین.[1]

کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نابێت ئەگەر لەناو گەلێکی ئاوهادا خەڵکانێک هەڵکەون ئەم گۆڕانکاریە سەرتاسەریەیان لە پەرستیش و ڕەفتار و سیستەمی کۆمەڵایەتی و نەریتە سەپێنراوەکانیان لا قبوڵ نەبێت. جوەکانیش هەروا بوون، ئەوان لە مەدینە و چواردەوری کۆبوبونەوە، لەناو قەڵا

(١) أخرجه أصحاب السير.

داخراوەکانیانـــدا سیســـتمێکی سیاســـی و کـــۆمەڵایەتی تایبەتیـــان هەڵبژاردبـــو، کە ئـــایین کـــاریگەریی گەورەی لە دارشـــتنیدا هەبـــوو، لەگەڵ دەوڵەمەندیـــدا کە دەســـت و هێـــزی تـــایبەتی هەیە لەپێشخســـتنی کەســـێک و دواخســـتنی ئەوی دیـــکەدا بـــا شایستەتریش بێـت، ئـاخر جـولەکە پـێش هـاتنی پێغەمـبەر ـ درودی خـوای لەسـەر ـ و دەرکەوتنـــی چاوەڕوانییـــان دەکـــرد و بەهیوابـــوون پێغەمـــبەر لەخۆیـــان بێـــت، کـــاتێکیش نێـــردرا بەو نیشـــانانەی لایـــان هەبـــوو دەیانناســـی و دەیـــانزانی راســـتە ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٤٦﴾ البقرة: ١٤٦ .[1]

کاتێکیش دڵنیابوون پەروەردگار لە گەلێکی دیکە پێغەمبەری بژاردە کردوە جگە لەوان، ئەمەیان پێناخۆشبوو هەندێکیان دڵیان پڕ بوو لە کینە، دەروون بەدیان بەرامبەر پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ بۆ دروست بوو کەوتنە دژایەتی و پیلانگێڕی.

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

ئەو روداوانەی رویاندا و ئەو هەوڵانەی خەڵکێکی بتپەرست و جولەکە و دوڕوەکان بۆ تیرۆرکردنی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر بێت ـ دایان، وا دەکەن باوەڕت وەها بێت کە زەمینەیەکی گفتوگۆ نییە تا ژووان و بەیەکگەشتنێک روو بدەن کە بە هۆیانەوە بگەن بە جۆرێک لە بەیەکگەیشتن. ئاخر بەیەکگەیشتن و گفتوگۆ چۆن پەیدا دەبن، کاتێک بکوژەکە دەگاتە کۆتایی رێگا و هەموو زەمینەیەکی دواندن و وەڵامدانەوەی تێکداوە.

بەڵام دوای ئەم خوێندنەوە سەرەتاییە، ـ خوینەری بەڕێز ـ وەرە با بزانین کۆتایی باسەکە دەگاتە کوێ؟ ئایا دەکرێت زەمینەیەک سازبکرێت بۆ گفتوگۆ لە نێوان بکوژێکی تاوانبار و ستەملێکراوێکی ئاشتی خوازدا، کە هەموو مافێکی هەیە توندترین سزا و تۆڵە بەو بکوژە خراپەکارە بگەیەنێت؟

---

(١) البقرة : ١٤٦. واتە: ئەوانەی کتێبمان پێ بەخشیوون پێغەمبەر (ﷺ) دەناسن هەروەك چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێگومان دەستەیەك لەوان ئەو راستییە دەشارنەوە، لەکاتێکدا دەشزانن محمد (ﷺ) فرستادەی خوایە.



## خواستی دووهەم

# چەند نموونەیەک لە گفتوگۆی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ بکوژ و تیرۆرستاندا

## بتپەرستێک لە هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەردا ـ دروودی خوای لەسەر ـ :

جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ لەگەڵ هۆزی (محارب خصفة) لە ناو باخێکی دارخورمادا کەوتە جەنگەوە، کاتێک ئەوان موسڵمانانیان بینی پرشوبڵاو و بێئاگان لە یەکتری، پیاوێکیان کە پێی دەوترا غەوسی کوڕی حارس هات تا گەیشتە سەر سەری پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر بێت ـ بە شمشێرەوە وەستا و وتی: کێ ڕێم لێدەگرێت بتکوژم؟ فەرمووی: الله، ئیتر شمشێرەکە لە دەستی بەربووەوە، ئەوجا پێغەمبەری خوا ـ شمشێرەکەی هەڵگرت و پێی فەرموو: ئەی کێ ڕێگری لە من دەکات؟ وتی: شمشێر هەڵگرێکی باشبە، فەرمووی: شایەتومان دێنیت؟ وتی: نا، بەڵام پەیمانت پێدەدەم لەگەڵت نەجەنگم و لەناو خەڵکێکیشدا نەبم لەگەڵت بجەنگن، ئیتر پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ وازی لێهێنا، ئەویش ڕۆشتەوە بۆ ناو هاوەڵەکانی و دەیوت: لای باشترینی خەڵکەوە هاتووم بۆ لاتان.[١]

## چەند ڕوویەکی ئەو بەسەرهاتە:

تۆ دەبینیت پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەستی گەشتە گەردنی ئەو دوژمنەی پێش چەند چرکەیەک دەیویست بیکوژێت، ئەگەر ـ دور لە ئەو ـ بە خوێن تینوبا یەکسەر خوینی دەڕشت، ئەوەتا شمشێرەکە لەدەستیدایە و هۆکار بۆ کوشتنیش بەهێز و ئامادەیە، کابرا غەدری خۆی کرد و بێ ئاگایی موسڵمانانی قۆستەوە تا گەیشتە شوێنی سەرکردەکەیان و هەنگاوی بۆ کوشتنیشی نا، هەموو هۆکاری شمشێر وەشاندنیشی گرتەبەر

(١) أخرجه ابن حبان في صحيحه باب صلاة الخوف برقم ٢٩٣٩.

بێ ئاگا لەو هێزە راستەقینە کە لە پشت ئیدارەدانی ئەم بوونەوەرەوەیە بە گشت ئەستێرە و مانگ و مرۆڤ و باڵندە و ئاوو درەختەوە، کە هێزی خودایە و دروستکردن و کاروبارەکان لای ئەون، ئەم بێئاگا لە دەسەڵاتی خودایی وتی: کێ ڕێگریم لێدەکات لە کوشتنت؟

کاتێکیش کێشەکە بەسەر خۆیدا شکایەوە و شمشێری لەدەست کەوت، هۆکارێکی نەما بۆ خۆپارێزی و پیلانێکی بەدەستەوە نەما، ناچار پەنای بۆ سۆز و بەزەیی ستەملێکراو برد و ستایشی کرد، چونکە سیفەتی بەرز و رەفتاری جوانی زانیبو، بۆیە درێژی نەکردەوە و تەنها ئەوەی وت: شمشێر هەڵگرێکی باشبە، وەک بڵێی دڵنیا بوو لە بڵندی و ئەدەب و دەروون بەرزی بەرامبەرەکەی.

## گفتوگۆی لەگەڵ بکوژ:

پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە هەلێکی لەبار و کاتێکی گونجاوی زانی، نەک بۆ سزادانی کابرای ناپاک ، بەڵکو بۆ دروستکردنی گفتوگۆ لەگەڵیدا، بەو ئومێدەی پەروەردگار لە ئاگر قوتاری بکات، بۆیە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە کابرا دەڵێت: ئایا شایەتومان دەهێنیت؟ ئا لێرەدا کابرای بکوژ هەستی بە رەوینەوەیەک کرد لەو هەوری تۆڵەی کە بە ئاسۆیەوە دیاربوو، لە رەنگ و روخساری پێغەمبەری خوا نیشانەی لێخۆشبوونی خوێندەوە، بۆیە ئەوەی قەناعەتی پێی بوو دەریبڕی، کە نەخێرە، لەبەرئەوەی کە نەخێر دەستەواژەیەکە داخستنی ڕێگا دەگەیەنێت، بۆیە کابرا بەڵامێکی پێوە ئاڵاند و شتێکی دیکەی خستە ڕوو (بەڵام پەیمانت پێدەدەم شەڕت لەگەڵ ناکەم و لەناو خەڵکێکیشدا نابم لەگەڵت بجەنگن).

ئا لێرەدا بۆنی ئەو حیکمەتانەی کە لە دڵ و دەروونی پێغەمبەردا بوون دەرکەوت، بە خوێندنەوەیەکی دروست و بۆچوونێکی واقیعی کۆتایی پێهێنا، قسەی کابرای قبوڵکرد، بە دەرکردنی یەک کەس لە سوپای دوژمن و بێلایەنکردنی ڕازیبوو، چونکە دەرفەتدان بە بکوژ کاتی دەداتێ بەڵکو بیرێک بکاتەوە و لە ئایندەدا خوای پەروەردگار هیدایەتی بدات.

## باڵیۆزی لێبوردەیی:

کابرا وەک پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ خوێندیەوە بوو بە باشترین باڵیۆز، مژدەی پێغەمبەرێکی بە بەزەیی دەدات، لە شوێنێک کە ڕەنگە دانیشتوانەکەی تەنها بە جادوگەر و تێکدەری نێوان خێزان و کوڕ و باوک ناوی ئەو پێغەمبەرەیان بیستبێت، وا شایەتێک لەناو خۆیاندا دێت و شایەتی ڕەفتاربەرزی و دەر و ناو جوانی بۆ دەدات، ئەمیش لای ئەو خەڵکە بە شایەتێکی دادگەر دادەنرێت و خەڵک قسەی لێوەردەگرن، چونکە ئەو پاڵەوانی هۆزەکەیەتی و نێردراویانە بۆ مەترسیدارترین ئەرک، کەچی وا بەپێی خۆی گەڕایەوە، کەواتە دەبێت بە ویستەکەی خۆی گەیشتبێت کە لەوەی بۆی چوو بوو گرنگترە، بۆیە بەم هەڵوێست دەربڕینە سەرسامی کردن و واقیعەکەی زۆر بە کورتی و پوختی خستنە بەردەم: لای باشترین خەڵکەوە هاتووم بۆ لاتان.

## گفتوگۆ و بزنێکی ژەهراوی:

ئەبو هورەیرە دەڵێت: کاتێک خەیبەر فەتح کرا بزنێکی ژەهرپیاکراو بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا نێردرا، پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: هەرچی جولەکەی ئەم ناوە هەیە بۆم کۆبکەنەوە، بۆیان کۆکردەوە، جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: من پرسیارتان لەسەر شتێک لێدەکەم ئایا راستگۆیانە وەڵامم دەدەنەوە، وتیان: ئەی ئەبولقاسم بەڵێ، فەرمووی: کێ باوکە گەورەتانە، وتیان: فلان باوکمانە، فەرموی: درۆ دەکەن، فلان کەس باوکتانە، وتیان: راست دەکەیت و چاکت وت، فەرمووی: ئەی راستگۆیانە وەڵامم دەدەنەوە ئەگەر پرسیاری شتێکی دیکەتان لێ بکەم؟ وتیان: ئەبولقاسم بەڵێ، خۆئەگەر درۆشت لەگەڵ بکەین وەک درۆکەی باوکمان بەمیش دەزانیت، فەرمووی: خەڵکی ناو ئاگر کێ دەبن؟ وتیان: ئێمە کەمێک تیایدا دەمێنینەوە، پاشان ئێوە جێگەمان دەگرنەوە، پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ پێی فەرموون: دەمتان داخەن بە خوا هەرگیز جێگەتان ناگرینەوە، پاشان پێی فەرموون: ئایا راستگۆیانە وەڵامم دەدەنەوە ئەگەر پرسیاری شتێکتان لێ بکەم؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئایا ژەهرتان بەم بزنەدا کردووە؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: چی وایلێکردن کە ئەمە بکەن؟ وتیان: ویستمان ئەگەر

درۆ بکەیت ئیدی لە دەستت بحەوێینەوە، ئەگەر پێغەمبەریش بێت زەرەرت پێ ناگەیەنێت.[1]

## شەیبە:

شەیبەی کوڕی عوسمان دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - غەزای حونەینی کرد، باوکم و مامم بیرکەوتەوە کە عەلی و حەمزە کوشتبوونیان، وتم: ئەمڕۆ تۆڵەی خۆم لە محەممەد دەکەمەوە، جا ڕۆشتم بۆی، دەبینم عەبباس بە لای ڕاستییەوە و قەڵغانێکی سپی وەك زیوێك ڕەشەبا تەپوتۆزی پێوە نەهێشتبێت پێ بوو، وتم: مامیەتی دەستبەرداری نابێت، لای چەپەوە بۆی چووم، ئەبو سوفیانی کوڕی حارسیش لای چەپیەوە بوو، وتم: ئامۆزایەتی دەستبەرداری نابێت، لە دواوە بۆی چووم، نزیکبوومەوە، نزیکبوومەوە، تا ئەوەندەی بەشی شمێروەشاندنم مابوو، کەچی بزیسکەیەکی ئاگرم بۆ هات وەك هەورە بروسکە وەها بوو، ترسام بمسووتێنێت، بۆیە پاشەوپاش گەڕامەوە، جا پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - لایکردەوە بۆم و فەرمووی: شەیبە وەرە، دەستی خستە سەر سنگم، تا خودا شەیتانی لەدڵ دەرکردم.

ئەنجامی ئەم دەستە خستنە سەر سنگە: شەیبە دەڵێت: (چاوم بۆ بەرزکردەوە، ئا لەو کاتەدا ئەو لە گوێو چاوم چیو چی خۆشەویستتر بوو لام، پێی وتم: ئەی شەیبە کافران بکوژە).[2]

## مرواری پرشنگداری مرواریەکانی گفتوگۆ

## فوزالە (دەستی خستە سەر سنگم):

فوزالەی کوڕی عومەیری لەیسی دەڵێت: (ساڵی فەتحکردنی مەککە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - کە خەریکی تەوافکردن بوو بە دەروی کەعبەدا،

---

(١) أخرجه البخاری في الجامع الصحيح في كتاب الطب برقم ٥٤٦١.

(٢) اخرجه الطبراني في مالعجم الكبير رقم ٧٠٢٨ قال الهيثمي وفيه ابوبكر الهندلي وهو ضعيف، واخرجه البيهقي في دلائل النبوة ٥/١٤٥ وقال له شاهد.

دەمویست بیکوژم، کە لێوەی نزیکبوومەوە فەرمووی: ئەوە فوزالەی؟ وتم: بەڵێ، فوزالەم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: چیت لە دڵی خۆتدا دەوت: وتم: هیچ خەریکی یادی خودا بووم، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - پێکەنی و فەرمووی پێم: داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە، پاشان دەستی خستە سەر سنگم).

ئەنجامی ئەم دەستخستنە سەر سنگە بەسۆزە لەسەر فوزالە دەڵێت:

(سوێند بەخوا دەستی بەرزنەکردەوە تا بوو بە خۆشەویستترین دروستکراوی خودا لە دڵمدا).[1]



(١) انظر الاصابة لابن رجب، مجلد/٨، رقم ٦٩٩٨.



## خواستی سێهەم
## بە پوختی

لەو ڕووداوانەی باسکرا دەکرێت ئالیەتی گفتوگۆ لەگەڵ بکوژ و تاوانبارانیدا هەڵێنجێنین، خۆپیاوکوژانیش لە کۆتاییدا مرۆڤن و گۆشت و خوێنن، چەند بە خوێن تینوو بن هەر بە مرۆڤی دەمێننەوە، چەند کینە لە دڵ و عەشقی کوشتار بن، خۆئەوانیش کۆمەڵە مرۆڤێکن، چەندە وا بێت بە خەیاڵیاندا رق و کینە دەروونیان تەنها بە کوشتار دادەمرکێتەوە، بەڵام خەڵکە بەرزەکە و پیاوە مەزنەکان لەدەستیان دێ نموونەیەکی ئاوازەی ئەدەب دادان و خاوێن کردنەوەیان و سەرلەنوێ دەروون داڕشتنەوەیان دابدەن، ئەویش بەخۆ بەرزتر گرتن لە سزادان و بازدان بە سەر ڕق و کینەدا و پێشکەشکردنی وینەیەکی جوانی چۆنیەتی لێبوردەیی بۆ بکوژەکە.

بە کورتی ئەو کەسایەتیە مەزنانە بەهێزترین وانەی خۆشەویستی بە لێبوردەیی و سنگفراوانیی دەڵێنەوە.

لەبەرئەوەش پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - بیرکردنەوەی بەردەوام و سەرنجی ورد و قوڵبونەوەی لە شتەکان هەبوە، بەو تیژبینیەی خۆی، بکوژەکانی وا دەبینی کە لە رووی سۆزداریەوە کەموکورتی بێ ئەندازەیان هەیە، جوڵەی هەستیان مردوە، بۆیە بەرنامەی لەگەڵ بکوژەکاندا لەسەر دوو بنەما داڕشت:

**یەکەم:** نزیکبوونەوەی جەستەیی و دەستخشاندنی بەدەنی، بەدەستهێنانێکی لەسەرخۆ و موبارەک و فینک بە سنگ و شان و سەریاندا، کە ئەمانە لای هەموو مرۆڤێک جەرگەی کاریگەری و مەڵبەندی هەستن و دەروونیان دەبزوێنێت.

**دووهەم:** لەبەرئەوەی نێردراو و پێشەکی بۆ هەموو نزیکبوونەوەیەک پێویستە، نێردراوی ئەو بەهێز و دڵگیر بوو، ئەوەی وردیلەیەک مرۆڤایەتی لە هەستیدا مابێتەوە بەرهەڵستی نێردراوەکەی پێ نەدەکرا کە بریتی بوو لە لێخۆشبوون و لێبوردەیی، کە زۆر بە دەگمەن مرۆڤ بەرهەڵستی و ڕاگردنی لەدەست ئەم داوە پێدەکرێت، چونکە خەڵک لەسەر ئەوە

راهاتوون کەسێک چاکەیان لەگەڵ بکات خۆشیان بوێت، لوتکەی چاکەکردنیش ئازادکردنی ئەستۆی پیاوکوژە، لێخۆشبوونە لە تاوانی گەورەی کەسێک کە هەنگاوی کوشتنی نابێت.

چونکە ئەو کەسەی بەرنامەی کوشتنی هەیە هەمیشە ئەوە دەخاتە خەیاڵی، یان دەگاتە ئامانجی و ناحەزەکەی دەکوژێت و کڵوکۆی دەروونی دادەمرکێنێت و خۆیشی دەربازی دەبێت، یاخود بەرنامەکەی سەرناگرێت و دیل دەکرێت، ئا لەم حاڵەتەشدا چاوەڕوانی کەمتر لە کوشتن و تۆڵەسەندنەوەی سەخت ناکات.

بەڵام کاتێک پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ هەر لە ساتەکانی سەرەتا کە دەمارگرژ دەبێت و تووڕەیی زاڵ دەبێت ئەو بە لێخۆشبوون بەرەو ڕوویان دەبووەوە، ئیتر بەدیەکەیان دەتووایەوە و خۆشەویستی دەخستە شوێنی، کینەی دڵانی لادەبرد و سۆز و پەرۆشی دەکردە میراتی، پاشان دەستی موبارەکی بەسەردا دەهێنان کە هێمای هەستی راستگۆییانە و خۆشەویستی دڵسۆزانە و کاریگەریی بەهێز بوو، ئەم دەستلێخشاندنە کۆتایی چیرۆکی وەرچەرخانە بەهێز و توندەکە بوو، کە لەویەڕی ڕق و دوریەوە وەردەچەرخا بۆ ئەویەڕی نزیکی و خۆشەویستی.

کێ چەندە سیفەتی بەرز و مەزنی هەبێت، ئەم سنگفراوانیەی لێنایەت، بەڵام موحەمەدی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ کە مەزنترین کەسە پێی خستبێتە سەر زەوی ئەمەی ئەنجامدا.

ئا بەم شێوە دەتوانین ڕێنمایی لە پێغەمبەری خوداوە هەڵێنجێنین سەبارەت بە گۆڕینی ڕق و کینە بۆ خۆشەویستی لە دڵی پیاوکوژ و تاوانباراندا، بەم هەنگاوانەی خوارەوە:

* گفتوگۆ و دواندنێکی کورت.
* تێپەڕاندنی بیرۆکەی دانپیادانانی بکوژ بە تاوانەکەیدا.
* راگەیاندنی راشکاوانەی لێخۆشبوون لێی.
* دەستلێدانی جەستەیی و بزواندنی هەستی ئەندامەکانی.
* واقیعی بوون و مامناوەندێتی لە پێشبینی کردنیدا.

باسی پێنجەم

# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵان



هــاوەڵانی پێغەمــبەر ﷺ پێشــەنگی ئــاینن، پێغەمــبەری خــوا ﷺ ســومبولەکەیە و ئەوانــیش کــاڵاکەین (خــاوەنی پــاکترین دەروون، قــووڵترین زانســـت، کەمـــترین ئەرک، رێکـــترین رێـــنما، جــوانترین حــاڵ بــوون لەنــاو ئەم ئــوممەتەدا، گەلێکبــوون خــوا هەڵبیــژاردن بــۆ هــاوەڵێتی پێغەمبەرەکەی و جێبەجێکردنی ئاینەکەی)



## خواستی یەکەم

# ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ

## ڕێخۆشکردن

هاوەڵانی پێغەمبەر - درووودوی خوای لەسەر - پێشەنگی ئاینن، پێغەمبەری خوا - درووودی خوای لەسەر - سومبولەکەیە و ئەوانیش کاڵاکەین (خاوەنی پاکترین دەروون، قووڵترین زانست، کەمترین ئەرک، ڕێکترین ڕێنما، جوانترین حاڵ بوون لەناو ئەم ئوممەتەدا، گەلێکبوون خوا هەڵیبژاردن بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەکەی و جێبەجێکردنی ئاینەکەی)[1].

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ۝١٠٠﴾ التوبة: ١٠٠.[2]

## هیچ پلەیەک ناگاتە شەرەفی هاوەڵێتی:

پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - بە هەندێک لە هاوەڵان کە درەنگانێک موسڵمانبون و شەرەفی هاوەڵێتی و بینینی پێغەمبەریان دەستکەوت فەرموو: جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر یەکێکتان بە ئەندازەی ئوحود زێڕ ببەخشێت ناگاتە مشتی یەکێکیان، ناشگاتە نیوەی).[3] نەوەوی دەڵێت: ماناکەی ئەوەیە ئەگەر کەسێکتان هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت پاداشتەکەی ناگاتە پاداشتی مشتێک یان نیو

---

(١) أخرجه ابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله برقم ١١١٦.

(٢) التوبة : ١٠٠. واتە: خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لەکاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووەو ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ئەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەر کەوتنێکی زۆر گەورەیە.

(٣) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب فضائل الصحابه باب تحريم سب الصحابة برقم ٤٧٣٣.

مشتی بەخشینی هاوەڵێکم.[1] ئەمە بۆ هاوەڵە دواییەکان وەها بێت ئەدی بۆ دوای ئەوان چۆنە؟

خوای پەروەردگار جاڕی وەرگرتنیان و ڕازیبوون لێیانی داوە و لە کتێبە مەزنەکەیدا ئەمەی تۆمارکردووە تا لە هەموو کاتت و شوێنێکدا بخوێنرێتەوە: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ١٨﴾ الفتح: ١٨ .[2] ئەمە جاڕدانی لەپێشخستنیان بڵاوکردنەوەی سەروەری هاوەڵانە لە گەشترین شێواز و ڕازاوەترین کاڵاو شیرینترین فەرمایشتدا.

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

گفتوگۆی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ بتپەرست و گاور و جولەکە و گەورە و سەرکردەکانی جیهان، تەنانەت لەگەڵ بکوژ و ناپاکەکاندا، گفتوگۆیەکی روونە، هۆکاری خۆی هەیە، کە ڕوشدەدات بایەخدارە، چونکە خۆ ئەو خەڵکە هەر لە سەرەتاوە باوەڕیان بە پێغەمبەر نییە و دان بە پێغەمبەرایەتیەکەشیدا نانێن، بۆیە گفتوگۆی وی لەگەڵیاندا گفتوگۆیەکی روون و کردارێکی جوان و بەرز و چاوەڕوانکراوە، ئاخر خەڵکێک چۆن باوەڕ بە ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی و حەقیقەتی بانگەوازەکەی دەهێنن ئەگەر دەرگای گفتوگۆیان لەسەر نەکاتەوە و قسەگۆڕینەوە ڕو نەدات و یەکتر نەدوێنرێت؟

بەڵام هاوەڵانی بەڕێز، کە باوەڕیان پێ هێنابوو، دڵیان بووبووە ئاوێنەی باوەڕ بە خوا و پێغەمبەرەکەی، خۆشەویستی ـ درودی خوای لەسەر ـ لە قوڵایی دەروونیاندا نیشتەجێ بوبو، گوێڕایەڵیکردنی پێغەمبەر لایان ئایین بو، بێگوێیکردنیشی تیاچوون و ستەم بو وەک

---

(١) انظر شرح النووي على مسلم، ٩٣/١٦.

(٢) الفتح: ١٨. واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووەلەو باوەڕدارانەی کاتێک پەیمانیان لە گەڵدا بەستیت لەژێر درەختەکەدا خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لەدڵەکانیاندا هەیە (لەنیاز پاکی و دڵسۆزی) هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسودەیی دابەزاندەسەریان و پاداشتی بەمژدەی سەرکەوتنێکی نزیک دانەوە.

**قورئانی پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب: ٣٦ [١]، ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ النور: ٦٣ [٢].

**هەرچەندە پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ لە دواندنی هاوەڵە بەڕێزەکانیدا ناچار نەبوو روونکردنەوە یان قسەگۆڕینەوە ئەنجام بدات، بەڵکو دەیتوانی ئەو بڕیار بدات و ئەوانیش جێبەجێکردنیان لەسەر بوو، ئەو فەرماندەرکردنی بەدەست بوو، ئەوانیش بەڵێ کردنیان لەسەر بوو، ئەو تەنها ئاماژەکردنێکی بەس بوو ئەوانیش گوێڕایەڵی دەبوون، بەڵام ئەو کەسەی پەروەردگاری بە باشترین شێوە پەروەردەی کردووە، مەبەستی بو بگاتە چلەپۆپەی کەماڵ و بڵندی، هەوڵی گەشتنیبوو بە لوتکەی حیکمەت، بۆیە ئەو ـ درودی خوای لەسەر ـ گفتوگۆی کردە ڕێبازێکی پەروەردەیی و بنەمایەکی فێرکردن و بناغەیەک بۆ ئاراستە و ڕێنمایی، بانگەواز و جیهاد، ئەمەش تەواوترین تەواوی و باشترین سیفەت و بڵندترین داخوازیە.**

**بۆیە ئەو پێگە بەرزو شارستانی و پلەی سەروەریەی کە هاوەڵان پێی گەیشتن، ئەنجامی ئەو بەرنامە بەرزە بوو کە پێغەمبەری ڕەحمەت ـ درودی خوای لەسەر ـ گرتبویە بەر لە دواندن و پەروەردەکردن و چاکسازیدا.**

**تۆ واقتوڕدەمێنێت لەو زۆرە سەرسوڕهێنەرە و لەو داهێنانە قەشەنگ و پرشنگدارە خاوێنە و ئامادەگیە کامڵە و جۆراوجۆریەی پەروەردە و چاکسازیەی پێغەمبەر، کە دەیگرتەبەر بۆ**

---

(١) الأحزاب: ٣٦. واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێک کە خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە، چونکە) ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕاو سەرلێشێواوە.

(٢) النور: ٦٣. واتە: مەگەر ئەوانە نازانن ئەو کەسەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بە ڕاستی ئاگری دۆزەخ بەشیەتی و بۆی ئامادەیە هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەشدا، ئا ئەوە ڕیسوایی و خەجاڵەتیەکی زۆر گەورەیە.

هاوەڵانی، گفتوگۆکانی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوەڵانیدا زۆرترن لەوەی لە کتێبێکدا کۆبکرێنەو و لە دووتوێی چەند پەڕەیەکدا هەڵدرێنەوە، ژیانی لەگەڵیاندا لێوانلێوە لە گفتوگۆ و وتووێژی جوان، بەڵام لەو گوڵزاری هونەرە من چەند گوڵێک دەچنمەوە، لەو کانگای زێڕە چەند پارچە زێڕێک هەڵدەبژێرم، کە خۆراکی گیان و شیفای دڵان و ئاسوودەیی دەروونن، پڕن لە خۆشیەک کە هەموو ماندویەتیەک بڕەوێنێتەوە، شادیەک هەموو غەم و پەژارەیەک بفڕێنێت.

ئەمەش لێزانی نووسەر و ئازایی دانەر ناگەیەنێت، بەڵکو ژیاننامەکەی ئازیزمان ـ دروودی خوای لەسەر ـ خۆی وەهایە، بەرەو هەرکوێ دەڕۆیت بۆنی دێت، هەر خوێندتەوە پێی دڵشاد دەبێت، خوێندنەوەی یەکێکە لە خۆشیەکان کە هێشتا لە دنیادا ماوە، بۆیە چاری مرۆڤی ماندوو دەروونی غەمبار بۆ حەوانەوە رووکردنە ئەو گوڵزارەیە، ئەوێ شیفا و تێراوی نۆشی گیانە، فەرمون با چەند نموونەیەکی ئەو گفتوگۆیانە وەرگرین.





## خواستی دووهەم

# چەند نموونەیەک لە وتوویژی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هاوەڵانیدا

### خوێن بە خوێن و روخان بە روخان:

کەعبی کوڕی مالیک دەڵێت: ئەو شەوە لەگەڵ خزمانمان خەوتین (مەبەستی شەوی عەقەبەیە)، لە دوای نیوەشەو لە جێگەی خۆمان دەرچوین بەرەو شوێنی دیاریکراو بۆ بینینی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ وەکو قەتێ خۆماندەشاردەوە، تاکو گەشتینەیەک لەلای عەقەبە، حەفتا پیاو بوین، دوو ژنیشمان لەگەڵدا بو، کە نوسەیبەی کچی کەعب و ئەسمائی کچی عەمر بون، لەوێ کۆبوینەوە تاکو پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ هات و عەبباسی مامی لەگەڵدا بوو، کە ئەو هێشتا بتپەرست بوو، یەکەم کەسیش عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب قسەی کرد: ئیتر ئەوەی روونکردەوە کە پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە پارێزگاری بەنی هاشمدایە، بەڵام دەیەویت کۆچ بکات بۆ مەدینە، بۆیە عەبباس دەیەویست دڵنیابێت لە پارێزگاریکردنی ئەنصارەکان لە برازاکەی و بەجێی نەهێڵن، ئەوانیش داوایان کرد پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ خۆی قسە بکات و چی پێ باشە لە مەرجدانان بۆ خۆی و خوای گەورە لێیان وەربگرێت.

پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: بەیعەتتان لێ وەردەگرم بمپارێزن لەوەی کە ژن و منداڵی خۆتانی لێ دەپارێزن، بەرائی کوڕی مەعرور کردی بە دەستیدا و وتی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی تۆی بەڕاستی ناردووە، وادەکەین، ئیتر پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بەیعەتی لێوەرگرتین، ئێمەیش خەڵکێکی خاوەن ئەزموون بوین لە جەنگدا، لە باوباپیرانمانەوە بۆمان مابوویەوە (ئەمە قسەی بەراء بوو)، ئەبولهەیسەمی کوڕی تیهان قسەکەی پێ بڕی و پرسیاری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، لە نێوان ئێمەو جولەکەکاندا هەندێ پەیوەندی هەیە و ئێمە دەیبڕین، ئایا ئەگەر ئێمە وامانکرد و خوای گەورە تۆی سەرخست و گەڕایتەوە مەککە و ئێمەت بەجێهێشت چی بکەین؟ پێغەمبەر ـ دروودی

خوای لەسەر ـ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: (بل الدم الدم، والهدم الهدم، انا منكم، وانتم مني، احارب من حاربتم، وأسالم من سالمتم)، واتە: خوێن و خوێن، روخان بە روخان، من لە ئێوەم ئێوەش لە منن، هەرکەسێک ئێوە شەڕی لەگەڵ بکەن شەڕی لەگەڵ دەکەم، ئاشتیش لەگەڵ هەرکەسێک بکەن ئاشتی لەگەڵ دەکەم.

ئینجا فەرمووی: (اخرجوا إلي منكم اثني عشر نقيبا ليكونوا على قومهم بما فيهم)، واتە: دوانزە کەس لە خۆتان دەرکەن با ببنە فەرماندە لەسەر ئەوانی تر، ئیتر ئەوانیش دوانزەیان دەرهێنا، نۆ کەسیان لە خەزرەج و سێ کەس لە ئەوس.[1]

## ئایا خودا ناردویەتی؟

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: رێگریمان لێکرابوو کە لە پێغەمبەری خوا پرسیاری هەموو شتێک بکەین، بۆیە حەزماندەکرد خەڵکێکی عاقڵی دەشتنشین بهاتبان و پرسیاری لێ بکەن و ئێمەش گوێمان لێبوایە، جا کابرایەکی دەشتنشین هاتو وتی: ئەی موحەمەد نێردراوێکت هاتوە دەڵێت گوایە تۆ وادەزانیت نێرداروی خودایت؟ فەرمووی: ڕاست دەڵێت، وتی: کێ ئاسمانی بەدی هێناوە؟ فەرمووی: خودا، وتی: ئەی کێ زەمینی دروست کردووە؟ فەرمووی: خودا، وتی ئەی کێ ئەو شاخانەی داچەقاندووە؟ ئەو هەموو شتانەی تیادا بەدی هێناوە؟ فەرمووی: خودا، وتی: دەی سوێندت دەدەم بەو زاتەی کە ئاسمان و زەوی بەدی هێناوە و ئەو شاخانەی داچەقاندووە، ئایا خودا تۆی ناردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت وایدەزانی کە لە شەووڕۆژێکدا پێنج نوێژمان لەسەرە، فەرمووی: ڕاست دەڵێت، وتی: تو ئەو زاتەی کە تۆی ناردووە، خودا ئەم فەرمانەی پێ کردویت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت دەڵێت: زەکاتی ماڵ و سەروەتمان لەسەرە؟ فەرمووی: راست دەڵێت، وتی: تو ئەو زاتەی تۆی ناردووە، خودا ئەم فەرمانەی پێ کردویت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت دەڵێت: ساڵانە ڕۆژووگرتنی مانگی رەمەزانمان لەسەرە، فەرمووی: ڕاست دەڵێت، وتی: تو ئەو زاتەی کە تۆی ناردووە، خودا ئەم فەرمانەی پێ کردوویت؟ فەرمووی:

---

(١) اخرجه أحمد في مسنده في مسند المكيين، حديث كعب بن مالك الأنصاري رضي الله تعالى عنه، برقم ١٥٥١٥، وصححه الألباني في تعليقه على فقه السيره للغزالي برقم: ١٤٩.

بەڵێ، وتی: نێردراوەکەت دەڵێت: هەرکەس توانای هەبوو حەجی ماڵی خودای لەسەرە؟ فەرمووی: راست دەڵێت، دەڵێت: ئیتر پشتی هەڵکردو ڕۆیشت، وتی: سوێند بەو زاتەی تۆی بەڕاستی ناردووە، هیچ لەوانە زیاتر ناکەم و هیچیشیان لێ کەم ناکەمەوە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: ئەگەر راست بکات بە دڵنیاییەوە دەچێتە بەهەشتەوە.[1]

## خوا لە پێغەمبەری خودا خۆش بێت:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: خەڵکێکی ئەنساری کە بینینان لەو سامانەی خودا بەخشیویە بە پێغەمبەرەکەی لە ماڵ و سەروەتی هەوازن پێغەمبەر سەد حوشتری بە کەسانێک دەدا وتیان: خوا لە پێغەمبەری خودا خۆشبێت، بە قوڕەیش دەبەخشێت و ئێمەی وازلێهێناوە، کە هێشتا شمشێرەکانمان دڵۆپەی خوێنی ئەوانی لێدەچۆڕێت، ئەنەس دەڵێت ئەم قسەیەیان گەیەنرایە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر)، ئەویش ناردی لە تەپۆڵکەیەک کۆی کردنەوە، جگە لەوان کەسی دیکەی لەگەڵ بانگ نەکردن، کاتێک کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) هەستا و فەرمووی: ئەو قسەیە چییە لەبارەی ئێوەوە پێمگەیشتووە؟ تێگەیشتووەکانی ئەنسار وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، برا گەورەکانمان هیچیان نەوتووە، بەڵام خەڵکێک لەناو کوڕ و کاڵەکانمان دەڵێن: خودا لە پێغەمبەری خودا خۆشبێت، بە قوڕەیش دەبەخشێت و واز لە ئێمە دەهێنێت، کە هێشتا شمشێرەکانمان دڵۆپەی خوێنی ئەوانی لێ دەچۆڕێت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: من بە کەسانێکی نەو موسڵمان دەبەخشم بۆ دڵڕاگرتنیان، ئایا ئێوە ڕازینابن خەڵک ماڵ و سامان ببەنەوە بۆ ناو کاروانەکەیان، بەڵام ئێوە پێغەمبەر ببەنەوە ناو کاروانەکەتان؟ سوێند بە خوا ئەوەی ئێوە پێی دەگەڕێنەوە باشترە لەوەی ئەوان پێی دەگەڕێنەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا پێی ڕازیین، جا پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) پێی فەرموون: ناڕەحەتییەکی سەخت دەبینن خۆتان بگرن تا دەگەنە خودا

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الإيمان، باب السؤال عن أركان الإيمان، برقم ٣٨.

و پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر)، من لەسەر حەوزی کەوسەرم) ئەنەس دەڵێت: بەڵام ئارامیان نەگرت.[1]

## "گفتوگۆی لەگەڵ عەبدوڵڵای کوری ئوبەی لە سەرەمەرگدا":

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) چووە سەردانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کرد لە کاتی ئەو نەخۆشینەی تێیدا مرد، کە چووە لای، مردنی تێدا بەدی کرد، فەرمووی: پێمدەوتی جولەکەت خۆش نەوێت، وتی: خۆ سەعدی کوڕی زرارە رقی لێیان بوو بیدەنگبە، جا کاتێک مرد کوڕەکەی هات بۆ لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی مرد، ئەو کراسەی خۆتم بدەیە تا بیکەمە کفن بۆی، پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) کراسەکەی داکەند و پێی دا.[2]

تێبینی: ئەم گفتوگۆیەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیم لە ڕیزی هاوەڵاندا هێناوە، دەشزانم کە دووڕویی و کافری ئەو جێگیرە، بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) ئەو و دووڕووەکانی دیکەشی هەر لەناو کۆی هاوەڵان ژماردوون وەک دەفەرمویت: با خەڵک نەڵێن موحەممەد هاوەڵانی دەکوژێت.[3]

## دانی رەبیع دەشکێنم:

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: رەبیعی پوری دوو دانی کچۆڵەیەکی شکاندبوو، رۆشتن داوای لێبوردنیان لە کەسوکاری کرد، بەڵام ڕازی نەبوون، جا خوێنباییان خستە بەردەمیان، بەوەش ڕازینەبوون، بۆیە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) فەرمانی تۆڵەکردنەوەیدا، جا ئەنەسی کوڕی نەزر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) تۆ ددانی

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، باب غزوة الطائف، برقم ٤٠٩٣.

(٢) أخرجه أبوداود في سننه في كتاب الجنائز، باب في العيادة، برقم ٢٧٣٣ واخرجه الحاكم في المستدرك في كتاب الجنائز ١٢٠٧.

(٣) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح، برقم ٤٦٣٥

ڕەببم دەشكێنيت؟ نەخێر سوێند بەو زاتەی كە تۆی بەحەق ناردووە، نابێت ددانی بشكێنيت! بەڵام پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: ئەی ئەنەس كتێبی خودا بڕیاری تۆڵەسەندنەوەیە، جا لە دوای ئەوە خزمانی كچەكە ڕازیبوون و لێی خۆشبون، لەوێدا پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: لەناو بەندەكانی خوادا كەسی وا هەیە هەر سوێندێك بخوات لەسەر خوا، خوا بۆی جێبەجێ دەكات.[1]

## ئەگەر نەمدۆزیتەوە:

جوبەیری كوڕی موتعیم دەگێڕێتەوە (ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەرـ ، لەسەر مەسەلەیەك قسەی لەگەڵ كرد و ئەویش فەرمانی كارێكی پێكرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر هاتمەوە و نەمدۆزیتەوە؟ فەرمووی: ئەگەر منت نەدۆزیەوە بڕۆ بۆ لای ئەبوبەكر).[2]

## كەفماڵی كەشتی:

لە جابری كوڕی عەبدوڵلاوە كە لە ساڵی فەتحی مەككە لە پێغەمبەری خوای ـ دروودی خوای لەسەر ـ بیستووە كاتێك لە مەككەدا بوو فەرموویەتی: خوا و پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ عەرەق و مردارەوەبوو و بەراز و بتپەرستییان حەرام كردووە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەدی بەزی مردارەوە بوو؟ ئێمە كەفماڵی كەشتیی پێدەكەین و پێستەی پێ چەور دەكەین و خەڵك ڕوخساری پێ جوان دەكەن؟ فەرمووی: نەخێر، ئەویش حەرامە، پاشان پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەو كاتەدا فەرمووی: خوا جولەكە لەناوبات، كاتێك خودا بەزەكەی لێ حەرامكردن، دەیانتواندەوە و پاشان دەیانفرۆشت و نرخەكەیان دەخوارد.[3]

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن ـ سورة البقرة ـ باب (يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم القصاص في القتلى)، برقم ٤٢٢٨.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الاعتصام بالكتاب والسنة، برقم ٦٩٦٣.

(٣) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب البيوع، باب بيع الميتة والاصنام، برقم ٢١٤٥.

## دزەکانی حەج:

ئەبوبیکرە نەفیعی کوڕی حارس دەڵێت: ئەقرەعی کوڕی حابس بە پێغەمبەری وت: دەزەکانی حەج لە هۆزی: ئەسلەم و غیفار و موزینە یان جوهینە هاتون و بەیعەتیان پێداویت! پێغەمبەر فەرمووی: ئایا ئەگەر هۆزەکانی ئەسلەم و غیفار و موزینە ـ یان جوهینە ـ باشتر بن لە هۆزەکانی بەنی تەمیم و بەنی عامر و ئەسەد و غیتفان هێشتا هەر زەرەرمەند و خراپن؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: نەخێر، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، ئەوان کە موسڵمان بوون لەوانی دیکە باشترن.[1]

## مەیکوژە:

لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە دەگێڕنەوە، ئەو بە پێغەمبەری خودای ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتوە: ئایا ئەگەر گەشتمە کابرایەکی کافر و کردمان بە جەنگ، ئەو شمشێرێکی کێشا بە دەستێکمدا و بڕی و پاشان لەدەستم هەڵهات و چوە بنی درەختێکەوە و وتی: بۆ خوا موسڵمان بووم، ئایا ئەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ دوای ئەو وتنەی، بیکوژم؟ پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: مەیکوژە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئاخر ئەو دەستیکی پەڕاندووم، ئەوجا ئەو قسەیە دەکات؟ پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: مەیکوژە، ئەگەر کوشتت، ئەو دەچێتە پلەوپایەی تۆ بەرلەوەی بیکوژیت، تۆش دەچیتە پلەی ئەو، بەرلەو قسەیەی کە کردوویەتی.[2]

## چێژە و خێریشە:

لە ئەبوزەڕی غیفاریەوە (خەڵکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بە پێغەمبەریان ـ دروودی خوای لەسەر ـ وت: ئەی پێغەمبەری خوا، دەوڵەمەندەکان هەرچی پاداشت هەیە بردیان، وەک ئێمە نوێژ دەکەن، وەک ئێمە بەڕۆژوو دەبن، بە ماڵ و سامانە زیادەکەشیان خێر دەکەن، فەرمووی: ئەی خوا شتی بۆ ئێوە دانەناوە کە خێری پێ بکەن؟

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المناقب، برقم ٣٢٥٠.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الزكاة برقم ١٧٤٥.

هەموو (سبحان الله) کردنێکتان خێرە، هەموو (الله أکبر) کردنێکتان خێرە، هەموو (الحمد لله) کردنێکتان خێرە، هەموو (لا اله الا الله) کردنێکتان خێرە، فەرمان بە چاکەتان خێرە، ڕێگری لە خراپەتان خێرە، سەرجێی کردنیشتان خێرە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا یەکێک لە ئێمە ئارەزووی خۆی دابمرکێنێتەوە بۆی دەبێتە پاداشت؟ فەرمووی: ئەی ئەگەر ئارەزووی بە حەرامێک دامرکاندەوە نابێتە تاوان؟ هەر بەو شێوەیە ئەگەر لە حەڵاڵدا دایبمرکێنێتەوە دەبێتە پاداشت بۆی.[1]

## ئەی بە چی ماڵی براکەت دەبەیت؟

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - نەهی لە فرۆشتنی بەروبووم کرد بەر لە پێگەیشتنی، پێی وترا: پێگەیشتن چییە؟ فەرمووی: تا سوور دەبێتەوە، جا پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: ئایا ئەگەر خودای پەروەردگار نەیهێشت بەربوومەکە پێ بگات، بەنرخی چی ماڵی براکەت دەبەیت؟[2]

## جوانیەکانی نەفامی:

لە حەکیمی کوڕی حوزامەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کۆمەڵێک کار هەبوو لە نەفامیدا دەمکرد، وەک: ئەرکی گەیاندنی خزمایەتی، بەندە ئازادکردن، خێر و بەخشین، ئایا پاداشتیان لەسەر وەردەگرم؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرمووی: لەسەر ڕابردووی خێر موسڵمان بوویت).[3]

## ڕووبارێک لەبەر دەرگا:

لە ئەبوهورەیرەوە کە بیستوویەتی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - فەرموویەتی: ئایا ئەگەر ڕووبارێک لەبەردەرگای کەسێکتاندا بێت، هەموو ڕۆژێک پێنج جار خۆی لێ

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المغازي، باب شهود الملائكة بدرا، برقم ٣٨٢٠.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح، كتاب البيوع، اذا باع الثمار قبل ان يبدو صلاحها، برقم : ١٧٤٥.

(٣) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح، كتاب الأدب، باب من وصل رحمه في الشرك ثم أسلم، برقم ٥٦٦٥.

بشوات هیچ چڵکی پێوە دەمێنێت؟ وتیان: هیچ چڵکی پێوە نامێنێت، فەرمووی: ئەوە وەک پێنج نوێژە فەرزەکەیە، خوای پەروەردگار گوناهەکانی پێ دەسڕێتەوە.[1]

## ئەوانە خراپەن و سزایان لەسەرە:

لە عیمرانی کوڕی حەسینەوە کە پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەگەر داوێنپیس و دز و عەرەقخۆرتان بینی چیان پێ دەڵێن؟ وتیان: خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەمانە خراپەن و سزایان لەسەرە، ئایا گەورەترینی گەورە گوناهەکانتان پێ بڵێم؟ هاوەڵدانان بۆ پەروەردگار، خودا دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا﴾ النساء: ٤٨[2]، ئەوجا سەرپێچی دایباب، پاشان فەرمووی خودا دەفەرموێت: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ لقمان: ١٤[3] دەڵێت: پێغەمبەری خودا پاڵی دابووەوە جا ڕاستبووەوە و فەرمووی: پاشان بوختانکردن، بوختانکردن.[4]

## پاداشتێکی خراپت دایەوە:

عیمرانی کوڕی حەسین دەڵێت: خێڵی سەقیف هاوپەیمانی عەقیل بوون، سەقیفەکان دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودایان بە دیل گرت، هاوەڵانی پێغەمبەری خوداش پیاوێکی بەنی عەقیلیان بە دیل گرت و حوشترێکیشیان لەگەڵ گرت، جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ هات بۆ لای دیلەکە کاتێک بەسترابووەوە، وتی: ئەی موحەمەد، ئەویش چووە لای فەرمووی: چیت دەوێت؟ وتی: بۆچی منت گرتووە؟ چۆن کەسێک دەگرێت

(١) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب المساجد، باب المشي الى الصلاة تحمي به الخطايا، برقم ١١١٥.

(٢) النساء: ٤٨. واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە.

(٣) لقمان: ١٤. واتە: فەرمانمان پێدا کە ئەی ئینسان سوپاسگوزاری منیش و دایک و باوکیشت بە، دڵنیابن کە گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە.

(٤) ابن حجر العسقلاني في المطالب العالية في كتاب الايمان والتوحيد برقم ٣٠٠٤. وأخرجه ابن حجر العسقلاني نحوه في موافقة الخبر بالخبرة ١/٣٥٦ وقال حسن غريب.

نیازی حەجی هەبێت؟ فەرمووی: لەبەر ڕێزی حەجەکە، تۆمان لە بەرامبەر تاوانی سەقیفە هاوپەیمانەکەتدا گرتووە، پاشان ڕۆشت، دووبارە بانگی کردەوە: ئەی محەممەد، ئەی محەممەد، پێغەمبەری خوداش ـ دروودی خوای لەسەر ـ کەسێکی بەڕەحم و نەرم بوو، گەڕایەوە لای و فەرمووی: چییە؟ وتی: موسڵمان دەبم، فەرمووی: ئەگەر کاتێک ئەمەت بوتایە کارت بەدەست خۆتبا، بەیەکجاری قوتارت دەبوو، پاشان ڕۆیی، کەچی بانگی کردەوە و وتی: ئەی موحەممەد، ئەی موحەممەد، ئەویش هاتەوە و فەرمووی: چیتە؟ وتی: من برسیمە، تێرمکە، ئاوم بدەیە تینوومە، فەرمووی: ئەمەیانت پێویستە، دوایی ئەمیان بە دوو کەسی تر گۆڕییەوە.

دەڵێت: ئافرەتێکی ئەنسارییش بەدیل گیرابوو و حوشترەکەشی پێوە بوبوو، ئافرەتەکە بەسترابووەوە، کاتێک خەڵکەکە لە ماڵەوە خەریکی مەڕ و ماڵاتەکانیان بوون، شەوێک توانی خۆی کردەوە، چوو بۆ ناو حوشترەکان، لە هەر حوشترێک نزیک دەبووەوە حوشترەکە دەسڵەمیەوە ئەویش وازی لێدەهێنا هەتا گەیشتەوە ئەو حوشترەی کە لەگەڵی پێوەبوبوو، ئەو نەسڵەمیەوە و یەخی بۆ کرد تا سواری بوو، پاشان بۆی دەرچوو، خەڵکەکە پێیانزانی دوای کەوتن، بەڵام نەیانگرت و ئەو خێراتر بو، دەڵێت: ئافرەتەکە نەزری کردبوو ئەگەر خوا رزگاری بکات ئەو حوشترە بکاتە قوربانی، جا هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (سبحان الله)، خراپترین پاداشتی داوەتەوە، نەزری کردووە ئەگەر خودا رزگاری بکات دەیکاتە قوربانی! نەخێر وەفا بە نەزرێک ناکرێت کە گوناه بێت، بە شتێکیش نابێت موڵکی خۆت نەبێت. لە ڕیوایەتەکەی ئیبن حەجەردا دەڵێت: نەزر لە سەرپێچی خوادا نییە. لە فەرموودەکەی حەماددا دەڵێت: ئەو حوشترە خێرایە هی پیاوێکی بەنی عەقیل بوو و لەپێشەوەی حوشترەکانی سەفەری حەجەوە بوو.[1]

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب باب لا وفاء لنذر في معصية الله برقم ٣١٧٩.

## ئەی کێ یەکەمیانی تووش کرد:

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: نەخۆشی ناگوازرێتەوە، کابرایەکی دەشتەکی وتی: ئەی بۆ حوشترێک دەبینیت، لەناو ئەو لمەدا وەک ئاسکە لە پاکێتییدا، کەچی حوشترێکی گول نزیکی دەبێتەوە، ئەویش گول دەبێت، پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر- فەرمووی: ئەی کێ یەکەمیانی تووش کرد؟[1]

## تۆ کوڕی گەورەیت؟

عەبدوڵلای کوڕی زوبێر دەڵێت: کابرایەکی خەسعەمی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم کە هاتوەتە ناو ئیسلام، پیاوێکی پیرە و توانای سواربوونی وڵاخی نییە، حەجیشی لەسەرە، ئایا ئەتوانم حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: تۆ کوڕە گەورەکەیتی؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەگەر باوکت قەرزێکی لەسەر بوو تۆ بیدەیتەوە ئایا جێگەکەی بۆ دەگرێتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی حەجی بۆ بکە.[2]

## خوا لە سزادانت خۆشبووە

ئەبو ئومامەی باهیلی دەڵێت: کاتیک پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - لە مزگەوتدا بوو، ئێمەش دانیشتبووین، کابرایەک هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تووشی تاوانێک بووم سزام بدە. پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - لێی بێدەنگ بوو، پاشان دووبارەی کردەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تووشی تاوانێک بووم، سزام بدە، ئەویش لێی بێدەنگ بوو، ئەوجا نوێژ کرا، کە پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - چووە دەر، ئەبو ئومامە دەڵێت: کابرا شوێنی پێغەمبەری خوا کەوت کە دەرچوو، منیش شوێنی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - کەوتم بزانم چ وەڵامێکی کابرا دەداتەوە، کابرا گەشتەوە بە پێغەمبەری خوا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تووشی تاوانێک بووم سزام بدە،

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الطب، باب لا عودى، برقم ٥٤٥٩.

(٢) أخرجه البيهقي في سنن الكبرى في كتاب الحج، برقم ٨١٠٨ وأخرجه الدارمي في كتاب المناسك باب حج البيت برقم ٥٠٩١.

ئەبو ئومامە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر بێت ـ پێی فەرموو: ئایا کە لە ماڵ دەرچوویت دەستنوێژێکی باشت نەگرت؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: پاشان لەگەڵ ئێمە نوێژت کرد؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ پێی فەرموو: دەی خودا لە تاوانەکەت خۆش بووە. یان وتی: گوناهەکەت.[١]

## گوێڕادێرن گەورەکەتان چی دەڵێت:

ئەبو هورەیرە دەڵێت: سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەگەر پیاوێک پیاوێکی لەگەڵ ژنەکەی بینی بیکوژێت؟ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: نەخێر، سەعد دەڵێت: بەڵێ، سوێند بەو زاتەی بەحەق ڕێزی لێ گرتوویت، جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: گوێڕادێرن بزانن گەورەکەتان چی دەڵێت؟[٢]

## دەست لە خراپە بگریتەوە خێرە بۆی:

ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: هەموو موسڵمانێک خێرکردنی لەسەرە، وترا: ئەی ئەگەر نەیبوو؟ فەرمووی: با بە دەستەکانی کار بکات کەڵک بە خۆی دەگەیەنێت و خێریشی پێدەکات، دەڵێت: وتیان: ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: هاوکاری خاوەن پێداویستیەکی تەنگاو بکات، دەڵێت: وترا: ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: با فەرمان بە چاکە یان خێر بکات، وتیان: ئەی ئەگەر ئەوەشی نەکرد؟ فەرمووی: با دەست لە خراپە بگرێتەوە، ئەوەش هەر خێرە.[٣]

(١) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب التوبة، باب قوله تعالى: ان الحسنات يذهبن السيئات، برقم ٥٠٩١.
(٢) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب اللعان، برقم ٢٨٤١.
(٣) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الزكاة، باب بيان اسم الصدقة يقع على كل نوع من المعروف، برقم ١٧٤٧.

## خوا زاناترە بەوەی دەیانکرد:

ئەبوهورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: هەر نەوزادێک لە دایک دەبێت لەسەر سروشت لەدایک دەبێت، ئیتر باوک و دایکی دەیکەنە جوولەکە یان گاور یان بتپەرست، کابرایەک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەگەر پێش لەوە بمرێت چی؟ فەرمووی: خودا زاناترە بەوەی دەیانکرد.[1]

## دەی تۆ شەهیدیت:

ئەبو هورەیرە دەڵێت: کابرایەک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەگەر پیاوێک هات بیەوێت ماڵ و سامانەکەم ببات؟ فەرمووی: ماڵ و سامانەکەی مەدەیە، وتی: ئەی ئەگەر لەگەڵما جەنگا؟ فەرمووی: لەگەڵی بجەنگە، وتی: ئەی ئەگەر کوشتمی؟ فەرمووی: تۆ شەهیدیت، وتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: ئەو لە ئاگردایە.[2]

## گوێڕادێرن و گوێڕایەڵ بن:

وائیلی کوڕی حەزرەمی باوکی عەلقەمە دەڵێت: سەلەمەی کوڕی یەزیدی جەعفی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر کۆمەڵە ئەمیرێکمان هەبوو داوای مافی خۆیانیان لێدەکردین و مافی خۆمانیان لێ قەدەغە دەکردین، چ فەرمانێکمان پیا دەدەیت؟ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ پشتی تێکرد، پاشان پرسیارەکەی لێکردەوە، هەر پشتی تێکرد، ئەمجا دووبارە یان سێبارە لێی پرسییەوە، ئیتر ئەشعەسی کوڕی قەیس ڕایکێشا، جا پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ

(١) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب القدر، باب معنى كلمة مولود يولد على الفطرة وحكم موت أطفال الكفار، برقم ٤٩٣٠.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الإيمان، باب الدليل على ان قصد مال غيره بغير حق، برقم ٢٣٢.

فەرمووی: گوێڕادێرن و گوێڕایەڵ بن، ئەوەی ئەوان هەڵیدەگرن و دەیکەن لە سەریان دەنوسرێت و ئەوەش ئێوە دەیکەن هەر ئەوەتان لەسەر دەنوسرێت.[1]

## سەردەمی ئاژاوە چی دەکەیت؟

ئەبو بەکرەی نەفیعی کوڕی حاریس دەڵێت: پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: ئاژاوە پەیدا دەبن، ئاگاداربن ئاژاوە پەیدا دەبن، ئەوەی دانیشتووە باشترە لەوەی ڕێدەکات، ئەوەی لەو کاتەدا ڕێدەکات باشترە لەوەی خێرا بۆی دەڕوات، ئاگاداربن، ئەگەر ئەوە داباری یان ڕوویدا، ئەوی حوشتری هەیە با بچێت بە لای حوشترییەوە، ئەوی ئاژەڵی هەیە با بچێت بە لای ئاژەڵەکەیەوە، ئەوی زەوییەکی هەیە با بچێت بە لای زەوییەکەیەوە، کابرایەک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - ئەی ئەگەر کەسێک نە حوشتر و نە ئاژەڵ و نە زەوی نەبوو؟ فەرمووی: شمشێرەکەی هەڵگرێت، دەمەکەی بکێشێت بە بەردێکدا و ئەگەر توانی خۆی قوتار بکات، خوایە ئەوا گەیاندم، خوایە ئەوا گەیاندم، خوایە ئەوا گەیاندم؟ کابرایەک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەگەر بە زۆر ناچارکرام بچمە ریزی یەکێک لەو دوو تاقمەوە و کابرایەک شمشێرێکی پیا کێشام یان تیرێک هات کوشتمی؟ فەرمووی: ئەو تاوانی تۆو خۆشی هەڵدەگرێت، دەبێتە هاوەڵی ئاگریش.[2]

## مۆڵەت لە دایکم وەرگرم؟

لە عەتای کوڕی یەسارەوە، کابرایەک لە پێغەمبەری خوای پرسی، ئەی پێغەمبەری خوا ، ئایا مۆڵەت لە دایکم وەرگرم کە دەچمە ژوورەکەی؟ فەرمووی: بەڵێ، کابرا وتی: من لەماڵەوە لەگەڵیدام، پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - فەرمووی: کە چوویتە ژوورەوە مۆڵەتی لێ وەربگرە، کابرا وتی: من خزمەتی دەکەم، پێغەمبەری خوا - دروودی خوای

(١) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الأمارة، باب في طاعة الأمراء وإن منعوا الحقوق، برقم ٣٥٣٩.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الفتن واشراط الساعة، باب نزول الفتن برقم ٥٢٦٥.

لەسەر ـ پێی فەرموو: مۆڵەتی لێ وەربگرە، ئایا حەز دەکەیت بە ڕووتی بیبینیت؟ وتی: نا، فەرمووی: کەواتە مۆڵەتی لێ وەربگرە.[1]

## قەرزی خوا زیاتر شایانی دانەوەیە:

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە کە ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتی: دایکم مرد و مانگێک ڕۆژووی لەسەر بوو، فەرمووی: ئایا ئەگەر قەرزدار بوایە، قەرزەکەت بۆ دەدایەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەی قەرزی خوا زیاتر شایانی دانەوەیە.[2]

## ئارامگر و نیازی خوا بێت، پەلاماردا و ڕانەکات:

ئەبو قەتادە لە پێغەمبەری خواوە دەگێڕێتەوە، کە هەستا لە ناویاندا ئەوەی بۆ باسکردن کە جیهاد لە پێناوی خودا و باوەڕبوون بە خودا باشترین کردەوەن، جا کابرایەک هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر لە ڕێگەی خوادا کوژرام هەموو گوناهەکانم دەسڕێتەوە؟ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ پێی فەرموو: بەڵێ، ئەگەر لە ڕێگەی خوادا کوژرایت و ئارامگر بیت و نیازت خوا بێت، پەلامار دەیت و ڕانەکەیت، پاشان پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: چیت وت؟ وتی: ئەی ئەگەر لە ڕێگەی خوادا کوژرام هەموو گوناهەکانم دەسڕێتەوە؟ پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئارامگر بیت و نیازت خوا بێت، پەلامار دەیت و ڕانەکەیت، جگە لە قەرز، ئەوە ئێستا جوبرەئیل ـ سەلامی خوای لەسەر بێت ـ وایپێوتم.[3]

---

(١) أخرجه مالک فی الموطأ في كتاب الاستئذان ـ باب الاستئذان برقم ١٧٥٠.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الصيام، باب قضاء الصيام عن الميت، برقم ٢٠١٠.

(٣) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الأمارة، باب من قتل في سبيل الله كفرت خطاياه الا الدين، برقم ٣٦٠٥.

## ناوچاو چار و دەست و قاچ سپییەکان

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ چووە گۆڕستانێک فەرمووی: ئەی ماڵی خەڵکی باوەڕداران سڵاوتان لێ بێت، ئێمەش بە ویستی خوا پێتان دەگەین، پێمخۆشبوو براکانمان دیبا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، مەگەر ئێمە برات نین؟ فەرمووی: ئێوە هاوڕێمن، براکانمان ئەوانەن هێشتا نەهاتوون، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ئەوانەی هێشتا نەهاتوون دەناسیتەوە؟ فەرمووی: ئایا ئەگەر کابرایەک کۆمەڵە ئەسپێکی ناوچاو چار و قاچ و دەست سپی هەبێت لەناو رەوە ئەسپێکدا نایانناسێتەوە؟ وتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەی ئەوانە بە هۆی دەستنوێژگرتنەوە بە ناوچاو چاری و قاچ و دەست سپی دێن، منیش لەسەر حەوزی کەوسەر چاوەڕوانیانم، ئاگاداربن لەو سەر حەوزەکە کەسانێک دەردەکرێن وەک چۆن حوشترە وێڵە دەردەکرێت، منیش بانگیان دەکەم وەرن بۆ ئێرە، جا دەوترێت: ئەمانە لە دوای تۆ گۆڕان، منیش دەڵێم: لەوەولاتر چن، لەوەولاتر چن.[1]

## ئایا حوشترت هەیە؟

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، منداڵێکی رەشم بووە، فەرمووی: ئایا حوشترت هەیە، وتی: بەڵێ، فەرمووی: رەنگیان چۆنە؟ وتی: سوورن، فەرمووی: ئەی بۆریان تیایە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی ئەوە چۆن بووە؟ وتی: رەنگە دزەی رەگێک بێت، فەرمووی: دەی رەنگە منداڵەکەشت هەر دزەی ئەو ڕەگە بێت.[2]

(١) أخرجه مسلم في صحيحه، كتاب الطهارة، باب استحباب الغرة والتحجيل في الوضوء، برقم ٢٩٨.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الطلاق ـ باب اذا عرض بنفي الولد برقم ٥٠١٤.

## مرواریەکی درەخشانی مرواریەکانی گفتوگۆ:

## کچەکەی حاتەمی تەی:

لە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: (سبحان الله) زۆر کەس خۆی لە خێر دووردەخاتەوە، سەیرە کابرایەک برا موسڵمانەکەی بۆ پێویستیەک بچێتە لای کەچی خۆی بە شایستەی ئەو خێرە نەزانێت، خۆئەگەر بە تەمای پاداشتیش نەبێت و لە سزاش نەترسایە هەر دەبوو لەو ڕەوشتبەرزیەدا خێرا بوایە، چونکە ئەوە نیشانەی گرتنەبەری ڕێگای سەرکەوتنە، جا کابرایەک هەستاو وتی: باوک و دایکم بە قوربانت بن ئەی گەورەی باوەڕداران ئەمەت لە پێغەمبەری خواوە بیستووە؟ فەرمووی: بەڵێ، لەوەش باشتر هەیە، کاتێک سەباباکانی هۆزی تەییان هێنا، کچێک سەرنجی ڕاکێشام، کچێکی کەژاڵی لێو ئاڵی باریک، گەردن بەرزی لوت قنج، بەژن و باڵای ڕێکوپێک، ڕان و پوز پڕ، ناوقەد باریک، شان و مل بتەو.

دەڵێت کە بینیم سەرنجی ڕاکێشام و وتم: داوا لە پێغەمبەری خودا دەکەم بیخاتە بەشەکەی منەوە، بەڵام کە کەوتە قسەکردن، لەبەر زمانپاراویەکەی جوانیەکەیم بیرچووەوە، وتی: ئەی موحەمەد ئەگەر دەکرێت ئازادمکە، تانەوتەشەری خەڵکی عەرەبمان مەهێنە سەر، چونکە من کچی گەورەی هۆزەکەمم، باوکم لێقەوماوانی دەپاراست، گیرۆدەی بەردەدا، برسی تێر دەکرد، رووتی پۆشتە دەکردەوە، ڕێزی میوانی دەگرت، خواردنی دەدا، سەلامی دەکرد، هەرگیز داوای خاوەن پێویستی ڕەتنەدەکردەوە، من کچی حاتەمی تەییم، جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: کچەکە بەڕاستی ئەمانە سیفەتی باوەڕدارانن، ئەگەر باوکت موسڵمان بوایە داوای ڕەحمەتی خودامان بۆ دەکرد، ئازادیکەن، چونکە باوکی ڕەوشتبەرزەکانی خۆشدەویست، خوای پەروەردگاریش ڕەوشتبەرزەکانی خۆشدەوێت، جا ئەبوبەردەی کوڕی نەیار هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا خوا ڕەوشتە بەرزەکانی خۆش دەوێت؟ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، بە ڕەوشتی جوان نەبێت کەس ناچێتە بەهەشتەوە.



# خواستی سێیەم
# بە پوختی

گفتوگۆکانی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - لەگەڵ هاوەڵانیدا زۆرترن لەوەی بژمێردرێن، لەوەش فراوانترن لێرەدا ریزیان بکەین، چونکە گفتوگۆ کە شێوازێکە لە شێوازەکانی فێرکردن و ڕێگەیەکە لە ڕێگاکانی قایلکردن، هەمیشە پێگەیەکی بەهێزیان هەبووە لە دواندنی هاوەڵان لە لایەن پێغەمبەرەوە - دروودی خوای لەسەر - ، هاوەڵانیش لە قوتابخانەی گفتوگۆی پێغەمبەرایەتی بیست و سێ ساڵ زیاتر پەروەردە دەکران و پێدەگەیەنران، زۆر لە هاوەڵان بەشێک لە گفتوگۆکانی مەککەیان دیوە پێش کۆچکردن، ئەوجا لە حودەیبییەدا، لە جموجوڵی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - لەتێکەڵکردنی خەڵکیدا، لە هاوەڵێتی ئەو باوەڕدارانەی خۆشی دەویستن و دووڕووە پیلانگێڕەکان و جولەکە و گاورانیش هەموویان بینیوە، ئەم گفتوگۆیانە لە دەروونیاندا ڕەنگی دابووەوە، ڕێبازی بیرکردنەوەیەکی عاقڵانەی لا دروست کردن، ئەوانە پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر- ئامادەی دەکردن بۆ هەڵگرتنی بەیداخەکە لە دوای خۆی و درێژەدان بە ڕێبازەکەی، لەڕاستیشدا ئەوانیش مەردانە بەڵێنەکەیان بردە سەر.

بۆیە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - هاوەڵان لە مەترسیدارترین کێشە و مەزنترین مەسەلەدا گفتوگۆیان دەکرد، دەگەڕانەوە بۆ لای کەلامی خودا و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی - دروودی خوای لەسەر - لەوانەوە دەگەشتنە لوتکەی ڕێنوێنی و بەرزایی دڵنیایی، ئەمە لەو کاتەدا ڕوویدا کە لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا کۆبوونەوە، کە لە دوای گفتوگۆ و پرس و ڕایەک کە لە قوتابخانەکەی یەکەم مامۆستای گفتوگۆوە فێر بووبوون گەشتنە باشترین ڕاو بڕیاردە.

پاشان هاوەڵان بە هەموو دۆڵ و شیوێکدا بڵاوبوونەوە، بەرەو هەموو شوێنێک ڕۆشتن، بوون بە زانای لەخواترس و خەڵکیان فێری زانستی گەورە و بچووک کرد، هیدایەتیان بڵاوکردەوە پێش زانین و قسە، ئەوانە بە جیهاد و نیازپاکی گەشتنە ئەوپەڕی ئازایەتی و لەدووی مەرگ دەگەڕان و دەستیان لە دنیا هەڵگرتبوو لای خودایان هەڵبژارد.

ئەوانە بوونە خوداپەرستانێک بە ڕۆژ بە ڕۆژوو بوون و شەوانیان زیندوو دەکردەوە، کە ناوی خودایان دەهێنا وەک لق و پۆی درەخت کە ڕەشەبا لێیدەدات ئاوها دەلەرزین، ئەوانە پیاوی مەرد و مەزن دەرچوون، خودایە ڕازیبە لێیان، لەوانەیان پێش فەتح کۆچیانکرد و جیهادیان کرد، لەوانەش لە دوای فەتحەوە موسڵمان بوون، هەمووشیان خودای مەزن بەڵێنی باشی بۆ داون.



## باسی شەشەم

# گفتوگۆی پێغەمبەری خوا ﷺ

# لەگەڵ هەرزەکاراندا



هاوەڵانی پێغەمبەر بە گشتی لاو بوون، پێغەمبەر ﷺ و ئەو لاوانە جێگەی سەرنجی منداڵ و هەرزەکارەکان بوون، لەوانەوە سەرمەشقیی دیاری دەکرا و فێری مەردایەتی دەبوون و چاویان لێ دەکردن، ئەمەش سروشتی تایبەتمەندی تەمەنە، ئالێرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیکی دەکردنەوە و ئەوانیش بەرەورووی دەهاتن، باوەشی بۆ دەکردنەوە و ئەوانیش رایاندەکرد بۆی و پێشبڕکێیان لە هاوڕێیەتی و خزمەتکردنیدا دەکرد.



# خواستی یەکەم

# ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەش بۆ گفتوگۆ

## ڕێخۆشکردن:

قۆناغی هەرزەکاری بەوە جیادەکرێتەوە کە قۆناغی هەڵچوونە، تیایدا بڵێسەی چالاکی سێکسی مرۆڤ دەستپێدەکات، مۆمی پێگەیشتنی دەروونی و ژیری دادەگیرسێت، ئەمڕۆ زۆرینەی هەرزەکاران ـ لە سایەی نەبوونی پەروەردەیەکی پتەو و ڕاشکاوییەکی بە بەرنامەدا ـ ئەم گۆڕانکاریە جەستەیی و دەروونییە بەهێزە بۆیان کوتوپڕە، بۆیە حەزێکی زۆریان لە سەلماندنی خۆیانە، دەیانەوێت منی ناوخۆیان تێر بکەن، لافاوی ئارەزوویان بەرەو داوی ڕەگەزەکەی تر دەیانبات، بەشێوەی پەیوەندی نائاسایی و دوور لە هەموو کۆتێکی ئەتواریی و ڕێبازێکی شارستانی، بۆیە هەندێکیان هەموو سنوورێک دەبەزێنن و بەسەر هەموو پیرۆزییەکدا باز دەدەن.

ئەگەر سەرنجدەیت دەبینیت زۆر لەوانەی ئالوودەی مادە هۆشبەرەکان بوون لەو هەرزەکارە تازە پێگەیشتووانەن، زۆرینەی لادانە سێکسی و دەروونی و فیکرییەکانیش لەم قۆناغە مەترسیدارە هەستیارەی تەمەنەوە پەیدا دەبن و نەشونما دەکەن.

لەبەرئەوەشە کە قۆناغی هەرزەکاری مەترسیدارترین قۆناغی تەمەنە کە مرۆڤ پێیدا تێدەپەڕێت و کاریگەرترینیشیانە لە ژیاندا، لێرەوە دەتوانرێت پێوانەی سەرکەوتنی گەلێک و ڕوخانی گەلێکی تر بکرێت، وەختێک سەرنجدەیت بزانیت کۆمەڵگا چۆن مامەڵە لەگەڵ دامەزراوە فێرکاری و دامودەزگا پەروەردەییەکاندا دەکات؟ باوکان و دایکان چۆن کۆرپەی شیرەخۆرە پێدەگەیەنن و ئاگاداری منداڵی سەرەتایی دەبن و ڕەفتاری تازەپێگەیشتوان ڕێکدەخەن؟! تاوەکو کە ناردنیانن بۆ قوتابخانە تۆوێکی چاکو پاک بن. جا ئەگەر ئەم ئاگاداری و بایەخپێدان و وریاییەت لەو دوو حاڵەتەدا بینی ئیتر دڵنیابە ئەو گەلە سەردەکەوێت و پێشدەکەوێت، خۆئەگەر ببینیت منداڵان پشتگوێ خراون و عەقڵ و ژیریان پەروەردە ناکرێت، منداڵ و هەرزەکاران هەواڵەی شاشەی تەلەفزیۆن و کەناڵەکانی تر کراون و لەوانەوە ئیلهام وەردەگرن و فێری توندوتیژی و تێکدان دەبن، کاتەکانیان بە

یارییەکانیانەوە دەکوژن بێگەردی و خاوێنیان لەو زۆنگاوانەدا لەکەدار دەکەن، ئەوە بزانە ئەو گەلە سەرناکەوێت و پێشناکەوێت، مەگەر خوا ﴿وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾﴾ سبأ: ٢١[1].

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

هاوەڵانی پێغەمبەر بە گشتی لاو بوون، پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ و ئەو لاوانە جێگەی سەرنجی منداڵ و هەرزەکارەکان بوون، لەوانەوە سەرمەشقیی دیاری دەکرا و فێری مەردایەتی دەبوون و چاویان لێ دەکردن، ئەمەش سروشتی تایبەتمەندی تەمەنە، ئالێرەوە پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ نزیکی دەکردنەوە و ئەوانیش بەرەورووی دەهاتن، باوەشی بۆ دەکردنەوە و ئەوانیش راپاندەکرد بۆی و پێشبڕکێیان لە هاوڕێیەتی و خزمەتکردنیدا دەکرد.

ئەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ بخوێنێتەوە و سەرنجیدا دەبینێت پەیوەندی لەگەڵ هەرزەکاراندا بەهێز بوە، بەشێوەیەک کابرا پێگەی منداڵەکەی لای پێغەمبەر پێ سەیر بوە، تا گەشتبووە ئەوەی هەرزەکار و گەنجەکان لە هەموان زیاتر پابەندی بوون و لێوەی نزیکبوون، شەوو ڕۆژ لە ماڵ و گەشتدا لێی نەدەبوونەوە، لە تەنیشتیەوە دەخەوتن، شوێنی خەوتنەکەیان لەگەڵی دابەش دەکرد، ئەویش بواری بە لاوان دەدا کە ڕابێن بەرەو کاملی، کەلوپەلەکەیان بۆ هەڵدەگرت و بەدەستیانەوە دەدا تا فێری شێوەی دەستنوێژگرتنی ببن، پاشان دەیانویست بزانن لە شەودا چی دەکات تا چاوی لێ بکەن.

عەبدوڵلای کوڕی عەباس دەڵێت: شەو لای پورە مەیمونەم خەوتم، وتم: سەیری نوێژکردنی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ دەکەم، جێگا بۆ پێغەمبەری خوا ڕاخرا، پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ لەسەر درێژاییەکەی خەوت، پاشان هەستاو دەم و چاوی سڕی، پاشان دە ئایەتی کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی خوێندەوە، تا تەواوی

(١) سبأ : ٢١. واتە: کە پەروەردگاری تۆ ئاگادارو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێکی لێ بزر نابێت.

کردن، پاشان شتێک هەڵواسرابوو هەڵیگرت و دەستنوێژی پێ گرت، پاشان هات و دەستی بە نوێژکردن کرد، منیش هەستام وەکو ئەوم کرد، پاشان هاتم و لە تەنیشتییەوە وەستام، جا دەستی خستە سەر سەرم و پاشان گوێی گرتم هەڵیدەگلۆفی، پاشان دوو رکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان ڕکاتێکی تاکی کرد.»[1]

هەرئەوەندەش نا، بەڵکو لە گەشتەکانیشدا هاوڕێیەتیان دەکرد و پێوەی دەلکان، ڕێکدەکەوت وڵاخەکەیان نزیکی دەکردەوە تا لاوەکە دەستەکانی رادەکێشا و پێغەمبەری خوداش ـ درودی خوای لەسەر ـ دەستی بۆ نێوان پشت و سکی دەچەماندەوە و کوڵمی دەلکاند بە پشتیدا، ئەمەش ئەوپەڕی نزیکی و جوانترین خۆشەویستی بوو.

ڕێکیشدەکەوت دەستی دەگرت بە پشتی منداڵەکەوە یان بەسەری هەرزەکارەکەوە نەبادا لەسەر وڵاخەکەی بەربێتەوە لەکاتی ڕۆشتنیدا، جا توخوا پێمبڵێ ئەمە چ پیاو و چ مرۆڤێک بووە؟ دەی ئیتر پێویستە باسی زەمینەسازی گفتوگۆکردنت بۆ بکەم؟ لەڕاستیدا زەمینەکان هەموو توانەوە و نێوانەکانیان کورتکرانەوە، لەمپەرەکان هەڵگیران، ئیتر داوای زەمینەی گفتوگۆی هاوبەش نامێنێت، بەڵکو بوو بە تێکەڵکردنی گیانەکان و پێولکانی جەستەکان و هاوئاوازی هەناسەکان، کەواتە چ زەمینەیەک لەم زەمینەسازترە.

خوێنەری بەڕێز لەم لاپەڕانەدا ڕوویەکی کەمی جوانترین گفتوگۆت بۆ دەگوازمەوە، لە نێوان پێغەمبەر و هەرزەکار و لاواندا، کۆمەڵێک بنەما و یاسای قووڵ کە پێویستمانە لەو هەڵوێستانە هەڵێنجین، تا ببنە ڕووناکی بۆ مامەڵەکردنمان لەگەڵ کورو کچە هەرزەکارەکانماندا، تا ئامێری دیدێکی دروست دەستخەین بۆ ئەوەی بتوانین لە لۆژیکی ئەو قۆناغەی هەرزەکار پێیدا تێدەپەڕێت تێبگەین.

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب التفسير باب والذين يذكرون الله قياما ...... رقم ٤٣١٢.



## خواستی دووهەم

# چەند نموونەیەک لە گفتوگۆی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ هەرزەکاراندا

### داوایەکی نامۆ:

ئەبو ئومامە دەڵێت: (لاوێکی نەوجوان هاتە لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەرـ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتی زیناکردنم پێ بدە، خەڵکەکە رووبانتێکرد و لێی تووڕە بون، وتیان: وس، وس، فەرمووی: نزیکبەوە، کەمێك لێی نزیك بوەوە، فەرمووی: دانیشە، دەڵێت: دانیشت، فەرمووی: ئایا بۆ دایکت پێتخۆشە؟ وتی: نەوەڵلا خوا بمکات بە قوربانت، فەرمووی: خەڵکیش هەروا پێیانخۆش نیە بۆ دایکیان، فەرمووی: ئایا بۆ کچەکەت پێتخۆشە؟ وتی: نەوەڵلا ئەی پێغەمبەری خوا بەقوربانت بم، فەرمووی: خەڵکیش پێیانخۆش نییە بۆ کچەکانیان، فەرمووی: ئەی بۆ خوشکەکەت پێت خۆشە؟ وتی: نەوەڵلا خوا بمکات بەقوربانت، فەرمووی: خەڵکیش بۆ خوشکەکانیان پێیان خۆش نییە، فەرمووی: ئەی بۆ پورت پێتخۆشە؛ وتی: نەوەڵلا خوا بمکات بەقوربانت. دەڵێت: دەستی خستە سەر سنگی و فەرمووی: خودایە لە گوناهی خۆشبە و دڵی پاکژکەرەوە و نامووسی بپارێزە، ئیدی دوای ئەوە ئەو گەنجە بەلای هیچ شتێکدا لای نەدەکردەوە.[1]

### خوێندنەوەی دەقەکە:

ئەم گەنجە ناخی پڕ لە بڵێسەی حەز و هەوەسو هێزی نێرینەییە، لەولاشەوە باوەڕ و لەخواترسیشی تێدایە. ئارەزوو تینی بۆ هێناوە و ژیانی لێ تاڵ کردووە، دەروونی مرۆڤ حەزی تاقەتپرووکێن و ئارەزووی لەتوانابەدەری تێدایە، بەڵام ئەم حەزو ئارەزووانە لەترسی کەوتنە حەرام و چاودێری خودایی و جێگیربوونی ئیمان دەتوانرێت جڵەویان نەدرێتە دەست.

(١) أخرجه الإمام أحمد في مسنده، مسند الأنصار، الحديث رقم : ٢١٦٧٦.

لەم ململانێیەدا ئەم لاوە تاقەتی نەما و مەیلی بەلای ئارەزوویدا شکایەوە و ناچار بۆ دامرکاندنەوەی روو لە پێغەمبەری خوا دەنێت و دەیەوێت مۆڵەتی بدات، دەشیزانی حەرامە، بەڵام هاتو داوای مۆڵەتی تایبەت دەکات، چونکە وایدەزانی لەم سەرزەوییەدا کەس وەك ئەو حەز و ئارەزوو کڵپەی تێدا نەسەندووە و زۆری بۆ نەهێناوە، بۆیە راشکاوانە و بوێرانە دەڵێت: (ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتی زیناکردنم پێ بدە)، ئەمە بەبێ پێشەکی و زەمینەسازییەك.

## هەڵوێستی ئامادەبووان:

خەڵکەکە سەرنجی دەدەن و لێی زوویر دەبن، چۆن داوایەکی وەها لە کەسێکی وەها دەکرێت!

داوایەکی زۆر نزم لە پیاوێکی بڵند دەکەیت! مۆڵەتی پیسییەك دەخوازیت لە پیاوێکی خاوێن! کە لێی توورە دەبن، مامۆستا هێمنەکە ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەبێتە نێوەندگیر، سەرکردەی پەروەرێن گوێی لە توورەبوونەکەی خەڵکەکە و بێزاریدەربڕینەکەیانە، بۆیە بانگی دەکات و گەنجەکەش کە توورەبون و بێزاری خەڵکەکە دەزانێت خێرا لێی نزیکبدەبێتەوە، پێغەمبەری میهرەبانیش ـ دروودی خوای لەسەر ـ رووی تێدەکات، ئەو هەرکەسی بدواندایە تەواو رووی تێدەکرد، جا لەگەڵ ئەم گەنجەدا کەوتە گفتوگۆیەکی پلەبەندی کورتی پرسیار و وەڵامێکی ئازادانە، کە جێگەی رامان و بیرکردنەوە بێت.

پەروەرێنە هێمنەکە ـ دروودی خوای لەسەر ـ چاکی ئەندازەگیری کردبوو، ئاخر ئەمە تۆ دەتەوێت دەروازەی شەرێکی ناقۆڵایەو ئاگر تێبەردانێکە کە دوایی نەکوژێتەوە و دەرگاکەش داناخرێت، ئیتر دەروونی لاوەکە ئەو کەیلی و تاسەیەی نامێنێت.

## کەواتە چارەسەر چییە؟:

چارەسەر بێدارکردنەوەی عەقڵە بەرامبەر بە حەزو ئارەزوو، وروژاندنی هیمەتبەرزییە بەرامبەر لاوازی دەروون.

## سەرەتای گفتوگۆکە:

پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ گەنجەکەدا گفتوگۆ بە ئازیزترین و خۆشەویستترین مێینە لەسەر دڵی دەستپێدەکات، بۆیە پێی دەڵێت: بۆ دایکت پێت خۆشە؟ واتە ئەم خراپە نەگریسە کە داوای مۆڵەتی بۆ دەکەیت، ئایا شتێکە بۆ ئازیزترینی ئافرەت کە دایکتە پێی رازیبێت؟

## بۆچی دایك؟

لە دایکەوە دەستیپێکرد تا هەستی لە باڵاترین ئاستدا بیزوێنێت، وەڵامەکە بە خێرایی و جەختکردن و سوێندی قورسەوە هاتەوە (نەخێر نەوەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا) جۆرێك خۆشەویستیشی تێدا بوو، (خوا بمکات بە قوربانت) وەك بڵێت: نە بەخوا بۆ دایکم پێمخۆش نییە خوا بمکات بە قوربانت ناوی دایکم بهێنیت کە خۆشەویستترین ئافرەتی دنیایە لە دڵما کە هەموو شتێك لەرێی ئەودا بەخت دەکەم.

وەڵامی پێغەمبەریش دیاربوو، کە لە نیازەکەی تێگەیشتووە، کەواتە ئەو غیرەتە زۆرەی تۆ لەسەر دایکت کە بەو وەڵامدانەوە خێرایەدا دەردەکەوێت، هەموو پیاوێکی دیکەش هەر ئاوهان (خەڵکیش بۆ دایکیان پێیانخۆش نییە)، دەیەوێت ئەم لاوە دوورتر لە دەرگاکەی خۆی بڕوانێت و مەترسییەکانی تێبگات.

پرسیارەکە تەنها لەسەر دایك کۆتایی نەهات، چونکە پێغەمبەری پەروەرێن ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەیەوێت دڵو دەروونی گەنجەکە بەتەواوی لەم خراپەیە پاك بکاتەوە، بۆیە پرسیارەکان پەل دەکێشێت بۆ خۆشەویستو نزیکەکانی دیکەی لاوەکە (کچەکەت، خوشکەکەت، پورت،....) کەواتە کە تۆ بۆ خزمە نزیکەکانت قبوڵت نەبێت، خەڵکیش رازی نابن.

باشە لەسەر زەویدا ئافرەتێك هەیە دایكی كەسێك، یان خوشكی یان پوور و كچی یەكێك نەبێت؟

دەی ئەم غیرەتەی تۆ كە بەرچاوت سوور دەكات، خەڵكی دیكەش هەر وەهان، ئەوەی تۆ پێت ناخۆشە ئەوانیش پێیان ناخۆشە.

ئەم وەڵامانە دڵی لاوەكە سارد دەكاتەوە و كاروباری بۆ روون دەكاتەوە، بەڵام هێشتا خڵتە و خاڵێكی هەر دەمێنێت، بۆیە مەزنێتی پێغەمبەرێتی دێتە ئاراوە، تا ئەو خڵتە و خاڵەش بسڕێتەوە.

(دەستی خستە سەری) رەنگە لەسەر سنگی، یان سەری، یان شانی بێت، ئەو دەستە پیرۆزە بە سۆزەوە لە لەشی گەنجەكە دەخشێت كە پڕە لە تێڕوانینی بە بەزەیی پێغەمبەرێتی، لەگەڵیشیدا دوعایەكی بە كوڵی بۆ دەكات كە ئەو خەیاڵە گوناهاویە و ئەو حەزە تاواناویەی لە دڵ دەرچێت (خودایە لە گوناهی خۆشبە و نامووسی بپارێزە).

دەبێت لە دوای ئەمە چی روو بدات؟ هەرگیز دێت بە خەیاڵا یان گومان دەبرێت یان چاوەڕوان دەكرێت، ئەم گەنجە حەزی حەرامێتی لە كەللەیدا بمێنێت؟ یان گوناە و تاوان پاڵی خراپەكردنی پێوە بنێت؟

فەرموون سەیری شوێنەوار و ئەنجامەكەی بكەن:

ئیتر ئەو گەنجە ئاوڕی بەلای هیچ شتێكدا نەدەدایەوە.

## ئەی سەلەمە بەیعەت بدە:

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەرـ گەشتینە حودەیبیە، هەزار و چوار سەد كەس بووین، ئاوەكەی پەنجا سەر ئاژەڵی بەسەرەوە بوو، بەشی نەدەكردن، دەڵێت: پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەسەر قەراغەكەی دانیشت و پاڕایەوە یان تفی تێكرد، دەڵێت: ئاو وا هەڵقوڵی هەموومان ئاومان خواردەوە و لێشمان هەڵگرت، دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە بنی درەختێكدا بانگی بەیعەت بەستنی كردین، دەڵێت: یەكەم كەس بەیعەتم پێدا، پاشان بەیعەتدراو

بەیعەتدرا، تا خەڵک نیوە بوو، فەرمووی: ئەی سەلەمە بەیعەت بدە، دەڵێت، وتم: هەر لە سەرەتای خەڵکەوە بەیعەتم پێدایت، فەرمووی: جارێکی تریش، دەڵێت: پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بینیمی بێ چەکم، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر چەک و جلی پێدام، پاشان بەیعەتم پێدا، تا خەڵکەکە گەشتە کۆتایی، فەرمووی: سەلەمە ئەرێ بەیعەتم نادەیتێ؟ دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە سەرەتای خەڵکەکەوە و لە ناوەڕاستیشیانەوە بەیعەتم پێدایت، فەرمووی: جارێکی تریش، دەڵێت: بۆ سێهەم جار بەیعەتم پێدایەوە، پاشان فەرمووی: سەلەمە کوا چەک و جلەکەت کە پێمدایت؟ دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا عامری مامم پێگەیشت بێ چەک بوو، منیش پێمدا، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ پێکەنی و فەرمووی: تۆ وەک ئەو کەسە وایت، یەکەمجار وتی: خودایە بمگەیەنە خۆشەویستێک کە لە خۆم خۆشەویستتر بێت، پاشان بتپەرستەکان ناردیان بۆ ڕێکەوتن تا چەند جارێک هاتوچۆمان کرد و ڕێککەوتین.[1]

## بەرماوەی خواردنەوەی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی دەڵێت: جامێکیان بۆ پێغەمبەر هێنا ئەویش لێی خواردەوە، منداڵێک کە لە هەموان بچووکتر بو لای ڕاستییەوە بو، کۆمەڵە پیرێکیش لای چەپیەوە بون، فەرمووی: ڕۆڵە مۆڵەت دەدەیت بیدەم بەو پیرانە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ بەرماوەکەی تۆ، کەس پێشی خۆم ناخەم، ئیتر پێیدا.[2]

## لەگەڵ پێغەمبەر دەخەوتم:

ڕەبیعەی کوری کەعبی ئەسلەمی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ـ دروودی خوای لەسەر ـ دەخەوتم ئاوی دەستنوێژ و پێویستیم بۆ ئامادە دەکرد، فەرمووی: داوایەک بکە،

(١) أخرجه مسلم في كتاب الجهاد والسير، باب غزوة ذي قرد وغيرها، برقم ٣٤٧٣.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب المساقات، باب في الشرب، برقم ٢٢٤٧.

وتم: داوای هاوەڵێتیتدەکەم لە بەهەشتدا، فەرمووی: ئەی جگە لەوە؟ وتم: تەنها ئەوە داوا دەکەم، فەرمووی: دەی هاوکاریم بکە بۆ خۆت بە زۆر سوژدە بردن.[1]

## مرواریيەکی پرشنگدار لە مرواریيەکانی گفتوگۆ:

## حوشترە وێڵبوەکەت چی لێهات؟

خەواتی کوڕی جوبەیر دەڵێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا - دروودی خوای لەسەر - لە (مرّ الظهران) دابەزین، دەڵێت: لە خێمەکەی خۆم چوومە دەرەوە، دەبینم کۆمەڵە ژنێك وتووێژیانە منیش حەزم لە قسەکانی دەکرد، گەڕامەوە و باوەڵەکەم کردەوە و عەبایەکم تێدا دەرهێنا و لەبەرمکرد، هاتمەوەو لایان دانیشتم، پێغەمبەری خواش - دروودی خوای لەسەر- لە کەپرەکەی خۆی هاتەدەرەوە و وتی: باوکی عەبدوڵلا بۆ لەناو ژناندا دانیشتویت، کە پێغەمبەری خوام بینی سامگرتمی و هاتمەوە بۆ ناو خەڵك، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: حوشترەکەم بەربووە بۆ پەتێك دەگەڕێم بۆی، ئیدی ئەو رۆیشت منیش دوای کەوتم، کراسەکەی خۆی بۆ هەڵدام و چووە کەپرەکەوە، سپێتی پشتیم دەبینی لەناو سەوزایی کەپرەکەدا، جا دەستی بەئاو گەیاندو دەستنوێژی گرت، ئاو بە ڕیشیدا هاتە خوار و دەکەوتە سەر سنگی، فەرمووی: باوکی عەبدوڵلا حوشترە بەربووەکەت چی لێهات؟ پاشان بارمانکرد، ئیتر لە رێگا هەرکە دەگەیشت پێم دەیفەرموو: سڵاو باوکی عەبدوڵلا حوشترە بەربووەکە چی لێهات؟ کە ئەمەم بینی خێرا گەڕامەوە مەدینەو خۆم لە هاتوچۆی مزگەوت و مەجلیسی پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر - دەپاراست، ئەمەش درێژەی کێشا تا جارێك کاتی چۆڵبوونی مزگەوتم بەفرسەت زانی و چوومە مزگەوت و دەستم بە نوێژ کردن کرد، پێغەمبەری خواش - دروودی خوای لەسەر - لەناکاودا لەماڵێکیەوە هات، کەچی دوو رکات نوێژی کورتی کرد، من نوێژەکەم درێژ کردەوە بەو هیوایەی بڕوات و بەجێمبهێڵێت، فەرمووی: باوکی عەبدوڵلا چەندەی دەتەوێت درێژی بکەوە، من هەڵناسم تا تەواوی دەکەیت، لە دڵی خۆمدا وتم: بە خوا مەعزەرەت بۆ پێغەمبەری خوا - دروودی

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في باب فضل السجود والحث عليه برقم ٧٥٤.

خوای لەسەر ـ دەهێنمەوە و دڵی پاك دەکەمەوە، جا کە فەرمووی: سڵاوت لێ بێت باوکی عەبدوڵڵا حوشترە بەربووەکەت چی لێهات؟ وتم: سوێند بەوەی تۆی بەڕاستی ناردووە، لەو ڕۆژەوەی موسڵمان بووم ئەو حوشترە بەرەڵا نەبووە، جا فەرمووی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت (سێ جار)، ئیتر دوای ئەوە ئەوەی پێشوی دووبارە نەکردەوە.[1]



(١) أخرجه الطبراني في الكبير، ٤٠٣٣، وقال الهيثمي في المجمع ٤٠٤ رجاله صحيح.



## خواستی سێهەم
## بە پوختی

یەکەم سوود کە لەم بەسەرهاتانەوە وەریدەگرین زەروورەتی بوونی پەیوەندییە لە نێوان هەرزەکار و پەروەردەکاردا، ئیتر ئەو پەروەردەکارە باوک یان مامۆستا یان برا گەورە بێت.

لەو بەسەرهاتانەی تێپەڕی، دەبینیت ئەو لاوە هەرزەکارە هاوەڵی زۆر نزیکی پێغەمبەر بو، قوتابی قوتابخانەکەی بو، قوتابخانەیەکی تێر و تەواو، مامۆستاکەی بەرنەدەدا و لێی دوورنەدەکەوتەوە، بەڵکو لە سەفەر و نشینگەشدا پێوەی نووسابو، شەووڕۆژ تێکەڵی دەکرد، چونکە دەروونی مرۆیی رەنگەکانی ژیان کاریگەری دەبێت لەسەری، بەپێی ئەو رەنگاو رەنگییە مامەڵە و هەڵسوکەوتی ئەمیش دەگۆڕێت، تۆ چەند قوتابی لێهاتو دەبینیت بە رۆژدا لە قوتابخانە سەرکەوتوبوە، بەڵام کە شەو دادێ لە یەکەم تاقیکردنەوەدا دەکەوێت و ماندووبوونەکەی بەفیڕۆ دەڕوات، یان چەندین لاو سەرگەردان بوون و چەندین هەرزەکار خلیسکاون لەبەر هاوڕێیەتی خراپ لە شەوێکدا.

بۆیە لەسەر پەروەردەکار و مۆچیاران پێویستە چەند رۆژ و شەوێک تەرخان بکەن بۆ تێکەڵکردن و پەیوەندی راستەوخۆ بە گەنج و نەوجەوان و هەرزەکارانەوە، تا رەنگەکانی حەز و جۆرەکانی ئارەزوویان لای ئەوان ئەرخەیان بن.

چەندین لاوی لێهاتوومان هەیە ئومێدی زۆریان پێ دەبەسترێت و هیوای دامەزراویان بۆ دەخوازرێت، لە شار و وڵاتەکەی خۆیدا لاوێکی رێکوپێک و مەردێکی هەڵکەوتوە، بەڵام کە دەچێتە گەشت و لە تاراوگە نیشتەجێ دەبێت، ئەو جوانییەی دەسڕێتەوە و تووشی هەڵدێر دەبێت، ئیدی ئەو ئومێدەی نیشتیمانی لە تاراوگەدا ون دەبێت، بۆیە پەروەردەکاری بەڕێز و مامۆستای سەنگین لە پەراوی سەفەرەکەیدا بوارێک بۆ بینینی لاوەکە دەدۆزێتەوە و بە کۆڵانەکاندا هاوڕێیەتی هەرزەکار دەکات، بەو شێوە پەروەردەکار گۆشە نادیارەکانی رەفتاری گەنجەکە لە کاتی سەفەردا دەبینیت و لایەنە تەڵخەکانیشی هەست پێدەکات.

سەفەرکردنی مامۆستا دەرفەتی ژیانە تا راستەوخۆ وێنای رۆح و ئاوێنەی ناخی قوتابییەکەی ببینێت، ئەو شتە ونانەی بۆ دەرکەوێت کە نەیبینیون، بەو شێوە پەروەردەی کاتی سەفەر پەروەردەیەکی بەهێز دەردەچێت و کاریگەریی هەمیشەیی دەمێنێتەوە لە دەروونی لاواندا.

## چەند جار لە ژیانی پێغەمبەردا دەخوێنینەوە:

(لە ماڵی پورم خەوتم).[1]

(پێغەمبەر خستیە پاشکۆی)..[2]

(شەوێک لای پێغەمبەر خەوتم).[3]

(هاوەڵێتی پێغەمبەری خوام کرد، نەمبینی لە سەفەردا خۆی بشوات).[4]

(هاوەڵێتی پێغەمبەری خوام کرد، لە دوو رکات زیاتری نەدەکرد لە سەفەردا).[5]

(رۆژێک لە پاشکۆی پێغەمبەردا بووم فەرمووی: رۆڵە چەند وشەیەکت فێر دەکەم).[6]

لەم نموونانە زۆرن...

## جا سەیر بکەن لە هەموویاندا جگە لە نەوجەوانێک یان لاوێک کەسێکی دیکەیان تێدایە؟

بنەماکانی موحەممەدیش لە گفتوگۆکردنیدا لەگەڵ لاواندا لە روانگەی ئەو بەسەرهاتانەی رابورد:

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح برقم ١١٦ عن عبدالله بن عباس.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه برقم ٢٣٣١ عن ابن عباس.

(٣) أخرجه أبو عوانه في مستخرجه برقم ١٨٢٠ عن ابن عباس.

(٤) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح برقم ١٠٦٣ عن ابن عمر.

(٥) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح برقم ١٠٦٣ عن ابن عمر.

(٦) أخرجه الترمذي في سننه برقم: ٢٥٢٩ عن ابن عباس رضى الله عنهما.

- پێدانی ماوەیەکی زەمەنی پێویست بە هەرزەکار تا لە مەرام حاڵی ببێت و لە نیاز تێبگات.

- تێگەیشتن لەو دۆخە نائاساییەی کە هەرزەکار پیایدا تێدەپەڕێت و ئارەزوو بەسەریدا زاڵە و هەڵەشەیی لەبری هێمنی و موغامەرە جێگەی حیکمەت دەگرێتەوە.

- گفت و لوتفی شیرین و زەردەخەنە بەسەر مۆڕ و مۆنیدا زاڵ بکرێت لەگەڵ هەموو کەسێکدا، بێگومان لەگەڵ گەنج و هەرزەکاراندا کاریگەریی زیاتر و پێویستتریشە.

- قبوڵکردنی دووبارەبوونەوەی هەڵە لە هەرزەکاردا لەبەر زاڵبوونی حەزی لەسەری و نەبوونی حیکمەتی تەواو و ڕەچاوکردنی پلەبەندی کە ئەو لە سەرەتای بڕینی پلەکاندایە.

- دەستلێدانی جەستەیی و نزیکبوونەوەی قالبی لێی، ناسینەوەی جێگای هەستەوەر و چەقی کاریگەریی لە جەستەیدا، لەوانە: سنگ، سەر، گوێ، کوڵم.

- هێورکردنەوەی قسە بەپەلەکانی کە هەڵچوون و سۆزگەریی بەسەریاندا زاڵن، بۆ کپکردنەوەی هەڵچوونی دەروونی و گەرم مجێزی.

- ئەزموونیانی بنەمایەکە لە بنەماکانی مامەڵەی مرۆیی، هەتا کەسێک شارەزایی و ئەزموون و تەمەنی کەمتر بێت زیاتر پێویستی بە مامەڵەی ئەزموونیان هەیە.



## باسی حەوتەم

# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەیدا



لەم ئایەتە مەزنە (اقرأ) دابەزیە سەر گۆشەگیرە تەنهاکەی ئەشکەوت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و دڵی دەلەرزی، تا گەشتەوە خەدیجە و فەرمووی: دامپۆشن، دامپۆشن، دایانپۆشی تا سامو بیمەکەی نیشتەوە، لەوسا بە خەدیجەی فەرموو: خەدیجە لەوە چیمە، راستییەکەی لە خۆم دەترسم، ئیتر هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە. خەدیجە وتی: نەخێر، مژدە بێت، سوێند بەخوا هەرگیز خودا تۆ سەرشۆڕ ناکات .



## خواستی یەکەم
# ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ

## ڕێخۆشکردن

ماڵ ئەو مێرگ و نشینگەیە کە مێرد لە دوای شەکەتیەوە، پەنای بۆ دەبات و ئەو سایەیە ماندوێتی تێدا دەحەسێتەوە، خێزانی راسالْیش ئەو سووکناییەیە کە مێرد پەنای بۆ دەبات.

تاریکە رێگاکان مرۆڤ ماندوو دەکەن و زەحمەتکێشان جەزرەبەیان تێدا دەچێژن، بەلاّم لە ماڵەوە خۆشەویستی و ئاسوودەیی و بەختەوەری جێگایان پڕ دەکاتەوە.

لە شارستانیەتی میللەتان و پەندی گەلاندا دەوترێت (لە پشتی هەموو پیاوێکی مەزنەوە ئافرەتێکی مەزن هەیە)، پیاو چۆن مەزن دەردەچێت کە گەڕایەوە ماڵەوە ئاژاوە و گرفت بەرەو ڕووی بووەوە. چ ماندوودەرچوونێك دەبێت لە رەنجی فەرهادیەوە بڕواتەوە بۆ لای روخساری گرژ و مۆن.

کەواتە کەی بحەسێتەوە و پشوو بدات!!

بۆیە ئەگەر لەسەر هەڵسوکەوتی دەرەوەی ماڵ حوکم لەسەر هەر پیاوێك بدەیت بە ویژدانەوە نابێت، بەڵکو راست ئەوەیە لەسەر هەڵسوکەوتی ماڵەوەی حوکم لەسەر رەفتار و بەها و ناخی پیاو بدەیت، چونکە ئەو حوکمە لەسەر خووە راستەقینەکەیەتی.

## زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ:

پەروەردگار سەبارەت بە پەیوەندی هاوسەرێتی دەفەرمویێت: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ البقرة: ١٨٧ [١].

---

(١) البقرة : ١٨٧. واتە: ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوە و ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان.

هاوسەریش بە پارچەیەک لە دڵ و دەروون و نیعمەتێکی مەزنی خودایی وەسف دەکات:
﴿وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾﴾ النحل: ٧٢ [1].

دیارە پەیوەندی هاوسەرێتی توساوترین پەیوەندی و نزیکترین مەسافەی نێوانی دوو کەسە، کێ وەک هاوسەران تێکەڵ دەبن و عەشقی پاکوبێگەردیان دەبێت؟!

ڕەنگە پیاو لە دایکی جودا بێتەوە، لە باوکی دورکەوێتەوە، لە براکانی بترازێت، بەڵام لەوکاتەوەی دەگاتە ژن، دەکەوێتە پێگەیەکەوە کە هەرگیز لێی جودا نابێتەوە و دوورناکەوێتەوەو لێی ناترازێت، بەشێوەیەک جگە لە مردن هیچ شتێک لێکیان جودا ناکاتەوە، ئەمە چ پەیوەندییەک و چ نزیکیەکە!

پیاو خەموخەفەتی لە خوشک و براکانی دەشارێتەوە، بەڵام ناتوانێت لە ژنەکەی بشارێتەوە، پیاو لە ناو خەڵکدا چەندە نزیک و کەسوکاریبن خۆدەگرێت، بەڵام لەماڵەوە کە خەمێک رویتێدەکات بێتاقەتی دەردەبڕێت و دەگری، وەک ئەوەی خۆی تەنها بێت.

ئافرەتیش هەر وەهایە، مێردە خۆشەویستەکەی جێگەی هاوڕێی ڕاستەقینە و باوکی بەسۆز و برای دڵسۆزی بۆ دەگرێتەوە، خەموبێزاری بەسەردا دەڕژێنێت، شادی و خۆشی بۆ دەگێڕێتەوە، هیچ خۆزگە و ئاوات و هیوایەکی لێ ناشارێتەوە.

دەی باسی چ زەمینەیەکی هاوبەش بکەین! ئاخر مەسافەی نێوانیان تواوەتەوە، جەستەکان پێکەوە ئاڵاون، ڕۆحەکان ئامێتە بوون، لەڕاستییدا هاوسەرەکان پێویستیان بە زەمینەیەکی هاوبەش نییە بۆ گفتوگۆ، خۆ ئەوان یەک شتن، یەک قەوارەن، یەک دەرون و یەک گیانن.

---

(١) النحل : ٧٢. واتە: خوا هەر لە خۆتان هاوسەرانی بۆ فەراهەم هێناون، هەر لە ڕێگەی هاوسەرانتانەوە کوڕو کوڕەزای پێبەخشیوون و لە هەموو ڕزق و ڕۆزیەکی چاك و پاك و بەسوود بەهرەوەری کردوون، (لەگەڵ ئەو ڕاستیانەدا) ئایا ئەوانە هەر بڕوا بەشتی پووچ و ناحەقی دەکەن و لە بەرامبەر نازو نیعمەتەکانی خواوە ئەوانە هەر ناشوکرو سوپاس نایەزێری و بێ باوەڕ دەبن؟



## خواستی دووهەم

# چەند نموونەیەک لە گفتوگۆکانی پێغەمبەر لەماڵەوە

### دڵێکی لەرزیو:

ئەم ئایەتە مەزنە (اقرأ) دابەزیە سەر گۆشەگیرە تەنهاکەی ئەشکەوت، جا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ گەڕایەوە و دڵی دەلەرزی، تا گەشتەوە خەدیجە و فەرمووی: دامپۆشن، دامپۆشن، دایانپۆشی تا ساموو بیمەکەی نیشتەوە، ئەوسا بە خەدیجەی فەرموو: خەدیجە ئەوە چیمە، راستییەکەی لە خۆم دەترسم، ئیتر هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە.

خەدیجە وتی: نەخێر، مژدە بێت، سوێند بەخوا هەرگیز خودا تۆ سەرشۆڕ ناکات، سوێند بە خوا تۆ خزمایەتی بەڕێوە دەبەیت، لە قسەکردندا راستگۆیت، دەستبار بۆ خاوەن پێویستی دەگریت، هاوکاری نەدار دەکەیت، رێزی میوان دەگریت، یارمەتی کارەستباران دەدەیت.[1]

### خوێندنەوەی دەقەکە:

خەدیجە، خوێنەری خۆشەویست ئەم ناوە هیچ شتێکت بیر دەخاتەوە؟ ئایا بیری هەڵوێستێکی مەزنت ناخاتەوە لە سەرەتای دابەزینی نوور و رژانی رەحمەتی خوایی، کاتێك جوبرەئیل ئەو رووناکییە پرشنگدارەی هێنا، دەمارەکانی حەزرەت راچڵەکێن، خوێنی وەرگرتن رژایە دڵی و سروەی نیگا سنگی لە شیرك و نەفامی سڕیەوە، بەڵام لەبەر خۆشحاڵبوونی لەرادەبەدەری و قورسی ئەو ئەرکەی پێی سپێررا بوو، پاڵەپەستۆیەك لە نێوان دڵشاد بوون بە نیگا و خەمی پەیامەکە پەیدا بوو لە نێوان فێنکی نیگا و گەرمی ئەرکەکەدا دڵی لەرزی.

---

(1) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن، ٤٦٨٥.

بەڵام جارێ ئارامبە... ئێستە لێرەدا تەواو نابێت، خۆزگەگەر دڵیش بلەرزێت لە ماڵەوە فێنکیەك هەیە ئەم ساردیە لا دەبات، ئەگەر جەستەش بشلەژێت لە ماڵەکەدا پەنایەکی بەهێز هەیە ئەم شلەژانە هێورکاتەوە، ماڵەکە خەدیجەی تیایە.

خەدیجە... پەیژەی سەرکەوتن کە پێغەمبەری بەرەو ژوور برد هەر لە یەکەم پلەی پەیامەکەوە، ئەو پەنایەکی فێنك بوو کە ئامێزی بۆ دڵێکی لەرزیو کردەوە.

## چاوانم دەنوون و دڵم نانوێت:

لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە کە پرسیاری لە عائیشە کردووە لە ڕەمەزاندا نوێژی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەرـ چۆن بووە؟ وتی: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ نە لە ڕەمەزان و نە جگە لە ڕەمەزاندا لە یازدە ڕکات زیاتری نەدەکرد، یەکەمجار چوار ڕکاتی دەکرد ، مەپرسە چەند شیرین و توولانی بوون، پاشان چواری دیکەی دەکرد، لە جوانی و توولانی ئەویش مەپرسە، پاشان سێ رکاتی دەکرد، عائیشە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پێش لەوەی ویتر بکەیت دەنویت؟ فەرمووی: عائیشە چاوانم دەنوون بەڵام دڵم نانوێت.[1]

## نەرمونیانبە:

عائیشە دەڵێت: جوەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ وتیان: السام علیک (مەرگت لێبێت) فەرمووی: وعلیکم (لە ئێوەش) منیش وتم: **السام علیکم ولعنکم الله وغضب علیکم**، پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: عائیشە هێور بە، نەرمونیانبە، زبر و توووند مەبە، وتی: ئەی نەتبیست چیان وت؟ فەرمووی: ئەی نەتبیست منیش چیم وت؟ وەڵامم دانەوە، ئەوەی من گیرابوو هی ئەوان گیرا نەبوو.[2]

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب صلاة المسافرين وقصرها، باب صلاة الليل، برقم ١٢٦٤.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الدعوات، باب قول النبي يستجاب لنا، برقم ٦٠٦٠.

## شیرخواردن لە کۆرپەیەتیەوەیە:

هەر عائیشە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ـ درورودی خوای لەسەر ـ هات بۆ لام و پیاوێکم لابوو، فەرمووی: عائیشە ئەمە کێیە؟ وتم: برای شیریمە، فەرمووی: عائیشە بزانن کێ براتانن، چونکە شیرخواردن لە کۆرپەییەوەیە.[1]

## هەور و با:

عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ـ درورودی خوای لەسەر ـ دەڵێت: پێغەمبەری خوام نەدیوە ـ درورودی خوای لەسەر ـ ئەوەندە پێکەنیبێت ددانەکانی کاکیلەی دەربکەوێت، بەڵکو زەردەخەنەی دەکرد، دەڵێت: هەر کە هەورێک یان بایەکی دەبینی لە دەم و چاویەوە دەردەکەوت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ـ درورودی خوای لەسەر ـ خەڵک کە هەور دەبینن دڵشاد دەبن، بەو ئومێدەی بارانی پێوە بێت، کەچی تۆ دەبینم بێتاقەتی بە دەم و چاوتەوە دەردەکەوێت؟ فەرمووی: عائیشە چ دڵنیاییەکم هەیە کە عەزابی پێوە نەبێت؟ قەومێک بە با سزاداران، قەومێکیش کە هەوریان بینی وتیان: ئەوە هەورە بارانمان بۆ دەبارێنێت.[2]

## خراپترین پیاوی هۆزەکەی:

عائیشە دەڵێت: پیاوێک مۆڵەتی لە پێغەمبەر وەرگرت بێت بۆ لای، کە بینی، فەرمووی: خراپترین پیاوی هۆزەکەیەتی و خراپترین کوڕی هۆزەکەیەتی، بەلام کاتێک دانیشت رووی لەگەڵی خۆشبوو، دەم و چاوی گەش بوو، کە کابرا رۆشت، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ـ درورودی خوای لەسەر ـ کە ئەو پیاوەت بینی ئاوها و ئاوهات وت! پاشان رووت لەگەڵی خۆش بوو، دەموچاوت گەش بوو، پێغەمبەر ـ درورودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئەی عائیشە کەی منت دیوە خراپ بێژبم؟ پێگەی خراپترین کەس لای خوا لە رۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە خەڵک لە ترسی خراپەکانی لێی دوور بکەونەوە.[3]

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الشهادات، باب الشهادة على الانساب، برقم ٢٥٢٧.

(٢) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب تفسير القرآن، باب قوله تعالى: فلما رأوه عارضا، برقم ٤٥٦٣.

(٣) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الجنة وصفة نعيم اهلها، باب فناء الدنيا، برقم ٥٢٢٩.

## سەیری یەکتر دەکەن:

عائیشە دەڵێت، لە پێغەمبەری خوام بیست فەرمووی: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بە ڕووت و قووتی و پێخاوسی کۆدەکرێنەوە، وتم ئەی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - ژن و پیاو هەمووی! سەیری یەکتر دەکەن؟ فەرمووی: ئەی عائیشە، ئیشەکە سەختترە لەوەی سەیری یەکتر بکەن.[1]

## مانگ بیست و نۆیە:

عائیشە دەڵێت: کە بیست و نۆ شەو تێپەڕی، پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - هاتە لام و لەمنەوە دەستی پێکرد، وتم ئەی پێغەمبەری خوا - دروودی خوای لەسەر - تۆ سوێندت خوارد یەک مانگ نەیەیت بە لامانا، بەڵام من ژماردوومە تۆ لە بیست و نۆ ڕۆژدا هاتیت؟ فەرمووی: مانگ بیست و نۆ ڕۆژە، پاشان فەرمووی: ئەی عائیشە من باسێکت لای دەکەم پێویست ناکات پەلەی تێدا بکەیت تا پرس بە باوک و دایکت دەکەیت، پاشان ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندمەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾﴾ الأحزاب: ٢٨ .[2] تا گەشتە ﴿وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ الأحزاب: ٢٩ .[3] عائیشە دەڵێت: سوێند بە خوا دەمزانی باوک و دایکم فەرمانم پێناکەن تا لێی جیا ببمەوە، دەڵێت وتم: ئا لەمەدا پرس بە دایک و باوکم بکەم؟ من خوا و پێغەمبەری خوا و ماڵی قیامەتم ئەوێت. موعەمەر دەڵێت: ئەیوب پێی وتم:

---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب الأدب، باب لم يكن النبي فاحشا ولا متفحشا، برقم ٥٧٠٤.

(٢) الأحزاب ، ٢٨. واتە: ئەی پێغەمبەر بەهاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دونیا و ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەست بەردارتان بەم.

(٣) الأحزاب ، ٢٩. واتە: خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتان دەوێت، ئەوە دڵنیا بن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی ئامادەکردووە (پێغەمبەر هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقی کردەوە هەموانیان خواو پێغەمبەرو پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد).

عائیشە وتی: بە ژنەکانت مەڵێ من تۆم هەڵبژاردووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ـ درووودی خوای لەسەر ـ پێی فەرموو: خودا بە موبەلیغ منی ناردووە نەک بە ڕقاوی و لاساری.[1]

## ئایا شەیتانەکەت بۆت هاتەوە:

عائیشە دەڵێت: شەوێک پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ لەلام دەرچوو، دەڵێت: غیرە گرتمی، کە هاتەوە بینیمی چی دەکەم، فەرمووی: چیتە؟ غیرە گرتیتی؟ وتم: ئەی چۆن کەسێکی وەک من غیرە نەکات لە کەسێکی وەک تۆ؟ جا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: ئایا شەیتانەکەت بۆت هاتەوە؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا شەیتانم لەگەڵە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: لەگەڵ هەموو کەسێکە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ تۆیشە؟ فەرموی: بەڵێ، بەلام پەروەردگارم یارمەتیدام لەسەری تا موسڵمان بوو.[2]

## ئەسپێک دەفڕێت:

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە غەزای تەبوک یان خەیبەر گەڕایەوە لە دالآنەکەدا پەردەیەک دادرابووە، بایەک هەڵیکرد پەردەکەی هەڵدایەوە، بوکڵەکانی عائیشە ـ یارییەکانی ـ دەرکەوتن، فەرمووی: عائیشە ئەوە چییە؟ وتی: کچەکانمە (بوکڵەکانمە)، ئەسپێکیشی لەناویاندا بینی، دوو باڵی پێوە بوو لە پەلە خورما، فەرمووی: ئەی ئەوە چییە لە ناوەڕاستیاندا دەیبینم؟ وتی: ئەسپە، فەرمووی: ئەوە چییە پێوەی؟ وتی: باڵەکانیەتی، فەرمووی: ئەسپ دوو باڵی هەیە؟ وتی: ئەی نەتبیستووە سولەیمان ئەسپی هەبووە باڵی پێوە بووە؟ دەڵێت: هێندە پێکەنی تا ددانەکانی کاکیلەیم بینی.[3]

---

(١) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الطلاق، باب في الإيلاء، برقم ٢٧٩٧.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب صفة القيامة والجنة والنار، برقم ٥١٦٠.

(٣) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الأدب، باب في اللعب بالبنات، برقم: ٤٣٤٠.

## رازاندنەوەی عائیشە:

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا - درووودی خوای لەسەر - هاتە لام و بەدەستمەوە پاوانەی زێڕی بینی، فەرمووی: عائیشە ئەمە چییە؟ وتم: دروستمکردووە خۆمیان پێ دەڕازێنمەوە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەی زەکاتی دەدەیت؟ وتم: نا یان چۆن خودا بیەوێت، فەرمووی: لە ئاگردا ئەوەندەت بەسە.[1]

## ئەی پێغەمبەری خوا تەنانەت بۆ تۆش:

جابری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: ئەبوبەکر مۆڵەتی وەرگرت بچێتە ژوورەوە بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا، خەڵکێکیشی بینی لەبەر دەرگای دانیشتبون مۆڵەتی بە کەسیان نەدەدا، دەڵێت: مۆڵەتی ئەبوبەکر درا و چووە ژوورەوە، پاشان عومەر هات و مۆڵەتی داوا کرد و مۆڵەتی ئەویش درا، پێغەمبەری بینی بێتاقەت و بێدەنگ دانیشتووە و ژنەکانیشی لە دەوری دانیشتوون، دەڵێت: عومەر وتی شتێک دەڵێم پێغەمبەر پێدەکەنێنم، جا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر کچی خاریجەت دەدی داوای بژێوی لێدەکردم، منیش بۆی هەستام و ملیم گرت، جا پێغەمبەری خوا - درووودی خوای لەسەر - پێکەنی و فەرمووی: وەک دەبینی ئەمانەش لە دەوری منن و داوای بژێویم لێدەکەن، ئیتر ئەبوبەکر هەستا بۆ عائیشە و ملی گرت و عومەر هەستا بۆ حەفصە و ملی گرت و پێیان وتن: ئێوە داوای شتێک لە پێغەمبەری خوا - درووودی خوای لەسەر - دەکەن کە نیەتی؟ وتیان: سوێند بە خوا هەرگیز داوای شتێک لە پێغەمبەری خوا - درووودی خوای لەسەر - ناکەین کە نەیبێت، پاشان پێغەمبەری خوا - درووودی خوای لەسەر - مانگێک یان بیست و نۆ ڕۆژ لەسەرجێیکردن لێیان دوورکەوتەوە، دواى ئەوە ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ۝٢٨﴾ الأحزاب: ٢٨،[2] تا گەشتە ﴿وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ

---

(١) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الزكاة، باب الكنز وما هو وزكاة الحلي، برقم: ١٣٦٩

(٢) الأحزاب : ٢٨. واتە: واتە: ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دونیا و ڕازاوەیەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پێ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەستبەردارتان ببم.

أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ الأحزاب: ٢٩.[1] دەڵێت: لە عائیشەوە دەستی پێکردو و فەرمووی: عائیشە من دەمەوێت بابەتێکت بخەمە بەردەم حەزدەکەم پەلەی تێدا نەکەیت تا پرس بە دایک و باوکت دەکەیت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ـ درووودی خوای لەسەر ـ چییە؟ ئەویش ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە بژاردەی تۆدا پرس بە باوک و دایکم بکەم؟ نەخێر، من خوا و پێغەمبەری خوا وماڵی ئاخیرەت هەڵدەبژێرم، بەڵام داوات لێدەکەم ئەمەی پێم وتی: بە ژنەکانت مەڵێ، فەرمووی: هەر ژنێکیان پرسیاریم لێ بکات پێی دەڵێم، خودا منی بە قیرسیچمە و ڕقاوی نەناردووە، بەڵکو بە فێرکار و ئاسانکار ناردوومی.[2]

## گفتوگۆی شەرعزانێک:

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا لە مزگەوتدا بوو، فەرمووی: عائیشە ئەو کراسەم بەرێ، وتی: من لە سوڕی مانگانەدام، فەرمووی: خۆ سوڕی مانگانە لە دەستدا نییە، جا کراسەکەی پێدا.[3]

## سەختترین ئایەت:

عائیشە دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ من سەختترین ئایەت لە قورئاندا پێدەزانم، فەرمووی: عائیشە کام ئایەتەیە؟ وتم فەرمودەی خودایی: (من يعمل سوءا يجز به) فەرمووی: عائیشە مەگەر نازانیت موسڵمان کە ناڕەحەتییەک یان دڕکێکی پیادەچەقێت، دەخرێتە بەر خراپترین ئیشی، هەرکەسێکیش لێی بپرسرێتەوە سزا دەدرێت،

---

(١) الأحزاب : ٢٩. واتە: خۆ ئەگەر ئێوە خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتتان دەوێت، ئەوە دڵنیا بن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێ ئەندازەی ئامادەکردووە (پێغەمبەر هەموو هاوسەرانی یەك یەك تاقی کردەوە هەموانیان خواو پێغەمبەرو پاداشتی قیامەتیان هەڵبژارد).

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الطلاق، باب بيان ان تخيير امرأته لا يكون طلاقا الابالنيه برقم ٢٧٩٢.

(٣) أخرجه مسلم في صحيحه في الحيض باب جواز غسل الحائض رأس زوجها و ترجيله برقم ٤٨٤.

وتی: مەگەر خودا نافەرموێت: (فسوف يحاسب حسابا يسيرا)، فەرموی: عائیشە ئەوە نمایشەکەیە، هەرکەس موناقەشەی حسابی لەگەڵ بکرێت سزا دەدرێت.[1]

## عائیشە چی دەتگریەنێت؟

عائیشە دەڵێت: بەرەو حەجکردن بەڕێکەوتین کە گەشتینە (سەرف) تووشی سووڕی مانگانە بووم، پێغەمبەر هاتە لام کە من دەگریام، فەرمووی: عائیشە بۆ دەگریت؟ وتم: کەوتمە سووڕی مانگانەوە، خۆزگە نەهاتبام بۆ حەج، فەرمووی: (سبحان الله) ئەمە شتێکە خوا لەسەر هەموو کچانی ئادەمی نووسیوە، فەرمووی: هەموو پەرستشەکانی حەج بەجێبهێنە تەنها تەوافی کەعبە مەکە، کە چووینە مەککەوە فەرمووی: هەرکەس دەیەوێت لە پێشەوە بیکات بە عەمرە با بیکات مەگەر کەسێک قوربانی لەگەڵ خۆی هێنابێت، دەڵێن پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ مانگایەکی لەبری ژنەکانی کرە قوربانی، شەو کە لە (بەتحا) بوون عائیشە پاک بووەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ ئایا هاوڕێکانم بە حەج و عومرەوە بگەڕێنەوە و من تەنها بە حەجەوە بگەڕێمەوە؟ جا پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمانی بە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر کرد بردی بۆ (تەنعیم) لەوێ نیەتی عومرەی هێنا.[2]

## عائیشە دەستت بەخۆڵاچێت:

عائیشە دەڵێت: دایکی سولەیمی ئەنساری کە دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ـ درودی خوای لەسەر ـ خودای بەرز و مەزن شەرم لە حەقدا ناکات ئایا ئەگەر ژنێک لە خەونیدا ئەوەی پیاو دەیبینێت ئەمیش بینی ئایا خۆشتنی لەسەرە یان نا؟ عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی دی، عائیشە پێی دەڵێت: ئۆف بۆ تۆ، ئایا ئافرەت شتی وا دەبینێت؟ پێغەمبەری خوا ـ

---

(١) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الجنائز، باب عيادة النساء برقم ٢٧٣٢.

(٢) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب المناسک، باب افراد الحج، برقم ١٥٤٩، واصله في البخاري: ٢٩٠.

درورودی خوای لەسەر ـ رووی تێکردم و فەرمووی: دەستت بەخۆڵاچێت عائیشە، ئەی ئەو لێکچوونە لە کوێوە دێت؟[1]

## بمهێڵە با پەرستشی پەروەرێنم بکەم:

عەتا دەڵێت: من و عوبەیدەی کوڕی عومەیر چووین بۆ لای عائیشە، بە عوبەیدی وت: زووتر کاتی ئەوە هاتبوو سەردانمان بکەیت، وتی: دایکە منیش وەک پێشینان دەڵێم: درەنگ سەردانی بکە، زیاتر خۆشەویست دەبیت، دەڵێ: وتی: واز لەم قسە سەیرانە بهێنن، ئیبن عومەیر وتی: سەیرترین شتت لە پێغەمبەر بینیبێت چییە؟ دەڵێ: بێدەنگبوو، پاشان وتی: شەوێکیان فەرمووی: عایشە بمهێڵە ئەمشەو پەرستشی پەروەرێنم بکەم، وتم: سوێند بە خوا من حەزم لە نزیکیتە و حەزیش لەوە دەکەم تۆ پێت خۆشە، وتی: جا هەستاو دەستنوێژی گرت و دەستی بە نوێژکردن کرد، دەڵێت: هێندە گریا تا کۆشی تەڕبوو، دەڵێت: دانیشتبوو جا هەستا و هێندە گریا تا ڕیشی تەڕبووم دەڵێت: پاشان هێندە گریا تا زەویەکە تەڕ بوو، جا بیلال هات مۆڵەتی بانگدانی لێ خواست، کە بینی دەگریە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەگریەی؟ خۆ خوای گەورە لە گوناهی بەرودوات خۆشبووە؟ فەرمووی: ئەی بیلال مەگەر بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم؟ ئەمشەو ئایەتێکم بۆ دابەزیوە هاوار بۆ کەسێک دەیخوێنێتەوە و بیری لێ ناکاتەوە ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾﴾ البقرة: ١٦٤ .[2]

(١) أخرجه ابوداود في سننه في كتاب الطهارة، باب في المرأة ما يرى الرجل، برقم ٢١٧.

(٢) اخرجه ابن حبان في صحيحه كتاب الرقاق، برقم ٦٢١ واصله في صحيح مسلم في كتاب صفة القيامة، ٥١٧١.

## گفتوگۆی نەخۆشێک:

عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - رۆژێکیان گەڕایەوە لام لەسەر تەرمێکەوە لە بەقیع، منیش سەرم ئێشی دەکرد و دەموت: هاوار سەرم، فەرمووی: عائیشە بەڵکو من هاوار سەرم، پاشان فەرمووی: چ زیانێک دەکەیت ئەگەر پێش من بمریت، خۆم بتشۆم و کفنت بکەم و نوێژت لەسەر بکەم و پاشان بتنێژم؟ وتی: وا دەزانم ئەگەر ئەوانەت تەواو کرد دەگەڕێیتەوەماڵەکەم و شایی لەگەڵ هەندێک لە ژنەکانتا دەکەیت! جا پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - زەردەخەنەیەکی کرد، پاشان ئەو ئازارەی لێدەرکەوت کە پێوەی وەفاتی کرد.[1]

## ئەوەی لە خوای گەورە دەترسێت:

عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَوا۟ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ۝٦٠﴾ المؤمنون: ٦٠،[2] ئەو کەسە ئەوەیە زینا دەکات و دزی دەکات و عەرەق دەخواتەوە و لە خواش دەترسێت؟ فەرمووی: نا، ئەی کچی ئەبوبەکر، بەڵکو ئەو کەسەیە نوێژ دەکات و زەکات دەدات و لە خوای بەرزو مەزنیش دەترسێت.

## هاوەڵانی درەختەکە:

جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: دایکی بەشیر پێی وتم: کە لە پێغەمبەری بیستووە - درودی خوای لەسەر - کە لای حەفسە بوو دەیفەرموو: خوایار بێت هاوەڵانی درەختەکە، ئەوانەی کە لە ژێریدا پەیمانیان بەست کەسیان ناچنە ئاگرەوە، حەفسە وتی: با، ئەی پێغەمبەری خوا، جا لێی تووڕە بوو، حەفسە وتی: (وإن منكم إلا واردها)، جا پێغەمبەر -

---

(١) اخرجه ابن حبان في صحيحه كتاب التأريخ، باب مرضى النبي - ﷺ - رقم ١٦٩٨، والألباني حديث حسن.

(٢) المؤمنون : ٦٠. واتە: ئەوانەش کە دەبەخشن لە زەکات و خێر دڵیان دەترسێت، نەوەکو لێیان وەرنەگیرێت، چونکە ئەوانە بێگومانن کە بۆ لای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە.

دروودی خوای لەسەر ـ فەرمووی: خوا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ٧٢﴾ مریم: ٧٢ [١].[٢]

## هاوار بۆ عەرەب:

زەینەبی کچی جەحش دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ رۆژێک چووە لای، پەشێواو بوو و فەرمووی: (لا اله الا الله)، هاوار بۆ عەرەب، لە شەڕێک کە نزیکبووەتەوە، ئەمڕۆ لە بەنداوەکەی یەئجووجەجوج ئەوەندەی ئەمە کراوەتەوە، (بە پەنجە بەرانە و دۆشاومژەی ئەڵقەیەکی دروستکرد)، زەینەبی کچی جەحش دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ ئایا ئێمە تیادەچین لەکاتێکدا پیاوچاکانمان لەناودا بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر خراپە زۆر بوو.[٣]

## بە درێژایی ئەمڕۆ لە کوێ بویت:

فاتمەی خوزاعی دەڵێت: رۆژێک لە عائیشەم بیست، وتی: رۆژێک پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ هات بۆ لام وتم بە درێژایی ئەمڕۆ لە کوێ بویت؟ فەرمووی: کەژاڵ لای ئوم سەلەمە بووم، وتم: تێرت نەخوارد لە ئوم سەلەمە؟ دەڵێت: زەردەخەنەیەک گرتی، جا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ ئەگەر چویتە دوو پارچە زەوییەوە یەکێکیان ئاژەڵی تێدا نەلەوەڕابوو ئەویدیکەیان تیایدا لەوەڕابوو، تۆ لە کامیان حەیوانەکانت دەلەوەڕێنیت؟ فەرمووی: لەوەی لێی نەلەوەڕاوە، وتم: دەی من وەک هیچ لە ژنەکانت نیم، هەموو ژنەکانت لای پیاوێکی تر بوون، جگە لە من، دەڵێت: پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ زەردەخەنەیەکی کرد.[٤]

---

(١) مریم: ٧٢. واتە: لەوەودوا ئەوانە ڕزگار دەکەین کە پارێزکارو خواناس بوون، ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا بەچۆکدا دەهێنین.

(٢) أخرجه مسلم في صحيحه في كتاب فضائل الصحابه، باب فضائل أصحاب الشجره، برقم ٤٦٧٥.

(٣) اخرجه ابن سعد في الطبقات الكبرى، ذكر ازواج رسول الله برقم : ٩٦٨١.

(٤) اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب النفقات، برقم ٥٠٦٤.

## هەستم بە فێنکایی ژێرپێی کرد لەسەر سکم:

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلاوە (فاتمە هات بۆ لای پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر- سکالای ماندوێتی دەستی کرد بە هۆی دەستاڕ هاڕینەوە، بیستبووی کە کۆیلە هێنراون و بەری ئەو نەکەوتووە، ئەوەی بۆ عائیشە باسکرد، کە پێغەمبەر هاتەوە عائیشە بۆی باسکرد، دەڵێت: ئەو کاتە هاتەوە ئێمە لە جێگاکانمان ڕاکشابووین، ویستمان هەستین، فەرمووی: لەجێی خۆتان بن، هات و لە نێوانماندا دانیشت، ئەوەندە نزیکبوو هەستم بە فێنکایی پێی کرد لەسەر سکم، جا فەرمووی: ئایا شتی لەوەی داوای دەکەن باشترتان پێ بڵێم، کە چوونە ژێر جێگاکانتان، سی و سێ جار (سبحان الله) و سی و سێ جار (الحمد لله) و سی و سێ جار (الله اکبر) بکەن ئەمە لە خزمەتچی بۆتان باشترە.[1]

## مرواری درەخشانی مرواریيەکانی گفتوگۆ:

عائیشە دەڵێت: ئەو شەوەی ئەو (مەبەستی پێغەمبەرە - درودی خوای لەسەر -) لامبوو، ئەمدیو و دیوی کرد، نەعلەکانی لای قاچەکانیدا دانا و عەباکەشی دانا، چەمکی کراسەکەی لەسەر جێگاکەی ڕاخست، ئەوەندەی پێنەچوو وایزانی من خەوتووم، جا نەعلەکانی لەسەرخۆ لەپێ کرد و عەباکەی بەهێواشی هەڵگرت و بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە و چووە دەرەوە و پێوەیدا، منیش فێستەکەم کردە سەر و سەرپۆشم دا پیایدا بە کراسەکەم خۆم پێچایەوە و بە دوایدا چووم تا گەیشتە گۆڕستانی بەقیع، منیش چووم، سێ جار دەستی بەرزکردەوە و زۆر ڕاوەستا، پاشان گەڕایەوە و منیش گەڕامەوە و پێشی کەوتم و چوومە ژوورەوە، یەکسەر ڕاکشام و ئەو هاتە ژوورەوە فەرمووی: عائیشە ئەوە چییتە؟ هەناسە بڕکێتە و دەترسیت؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: یان پێمدەڵێیت یان خودای بە لوتف و زانا پێم دەڵێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - بە باوک و دایکمەوە بە قوربانت بم، ئیتر بۆمگێڕایەوە، فەرمووی: کەواتە ئەو ڕەشاییەی کە لەبەردەممدا بینیم تۆ بوویت؟ وتم: بەڵێ، دەڵێت: لەپێکی وای کێشا بە سنگمدا ئازارم پێ گەیشت، پاشان فەرمووی: ئایا واتگومانبرد خودا و پێغەمبەرەکەی ستەمت لێ بکەن؟ وتم: خەڵک

---

(١) اخرجه البخاري في الجامع الصحيح في كتاب النفقات، برقم ٥٠٦٤.

چەند شت بشارنەوە خودا و پێغەمبەرەکەی پێی دەزانن، فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: جوبرەئیلم بینی هات بۆ لام نەهاتە ژوورەکەی تۆ، چونکە جلوبەرگت لابردبوو، بۆیە بانگی کردم و خۆی لە تۆ پەنا دا ، منیش وەڵامم دایەوە و لە تۆم شاردەوە، ئیتر وامزانی خەوت لێکەوتووە، ترساشم بەتەنیا بیت، ئەو فەرمانی پێکردم بچم بۆ سەرقەبرانی بەقیع و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەم.[1]



(١) أخرجه النسائي في سنن الكبرى في كتاب الجنائز برقم ٥١٤٠، وقال الألباني صحيح واصله في صحيح مسلم في كتاب الجنائز برقم ١٦٨١.



# خواستی سێهەم
# بە پوختی

**خوای مەزن دەفەرموێت:** ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ١٨٤ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ١٨٥ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ١٨٦ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١٨٧ قَالَ رَبِّيٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ١٨٨ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ١٨٩﴾ الشعراء: ١٨٤ - ١٨٩ [١] **پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ تایبەتمەندی بەسەر هەموو پیاوێکەوە هەبوو، هیچ کەس هاوشانی نەدەوەستایەوە و لێشی نزیک نەدەبوونەوە، چونکە بۆ گەیاندنی پەیامێک بژاردە کرابوو، کە کۆتایی بە هەموو پەیامەکان هێنا، بەڵام ئەمە واینەکرد لەو پێغەمبەرە رەحمەتە کە گفتوگۆکارێکی لێهاتوو نەبێت لە ماڵەکەی خۆیدا.**

**دەبینین پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ گفتوگۆی لەبری فەرمانپێکردن هەڵبژارد، قسەی خۆش و جوانی پێش زۆرەملێ و تۆپزی خست، خێزانەکانی لە هەموو کاروبارێکدا دەیاندواند، لەبەر سنگفراوانی و نەرمونیانیەکەی تیاییدا دەیانبینی خۆ هەرئەوە دەفەرموێت: (باشترنیتان ئەوانەن بۆ کەسوکارتان باش بن، منیش باشترینتانم بۆ کەسوکارم).** [٢]



(١) الشعراء: ١٨٤- ١٨٩. واتە: هەر لەو زاتە بترسن کە ئێوەش و نەوەکانی پێش ئێوەشی دروست کردووە. (نەفامان) وتیان: بەڕاستی تۆ ئەی شوعەیب هەر لە جادوو لێکراوانیت. تۆ تەنها مرۆڤێکی وەک ئێمەیت و هیچی تر، بەڕاستی واگومان دەبەین کە لە درۆزنان بیت!! دە پارچەیەک لە ئاسمانەوە بەسەرماندا داباریێنە ئەگەر تۆ لە ڕیزی ڕاستگۆیاندایت؟! شوعەیب وتی: من دڵنیام لەوەی کە پەروەردگارم ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن. سەرەنجام، قەومی نالەبار بڕوایان بە شوعەیب نەکرد، ئیتر سزای هەورو سێبەر (کە لە ژێریدا ئاگر باران کران) دایگرتن، بەڕاستی ئەو سزایە سزای ڕۆژێکی گەورەو سەخت بوو.

(٢) أخرجه ابن حبان في كتاب الحج، باب الهدى برقم ٤٢٤٤.

## باسی هەشتەم

# گفتوگۆی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ فریشتەکان



جوبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و سەیری ئاسمانی کرد، بینی فریشتەیەک دادەبەزێت، جوبرەئیل پێی وت: ئەمە فریشتەیەکە لەو کاتەوە دروستکراوە تا پێش ئەم ساتە دانەبەزیوە، جا کاتێک دابەزی، وتی: ئەی موحەممەد ﷺ! پەروەردگارت منی ناردووەتە لات، ئایا پاشاییت دەوێت یان بەندە و پێغەمبەر بیت؟ جوبرەئیل وتی: ئەی موحەممەد خۆت بۆ خوا خاکەراکە، فەرمووی: بەندە و پێغەمبەریم دەوێت.



# خواستی یەکەم

## ڕێخۆشکردن و زەمینەی هاوبەشی گفتوگۆ

### ڕێخۆشکردن

خوا دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ۝٧٥﴾ الحج: ٧٥ [1] **خوای بەرز و مەزن پۆلێک فریشتەی هەڵبژاردو ڕێزو شەرەفی زیادی پێ بەخشین، لەناو ئەوانەشدا جوبرەئیلی هەڵبژارد، شەرەفی بەڕێزترین ئەرک و مەزنترین سپاردەی پێ بەخشی** ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ۝١٩٣ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ۝١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ۝١٩٥ وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝١٩٦﴾ الشعراء: ١٩٢ - ١٩٦ [2].

**هەروەها پەروەردگارمان لەناو ئادەمیزاددا کۆمەڵێک پێغەمبەری هەڵبژارد کە لە باشترینی بەندەکانن، لەناو ئەوانەشدا پۆلێکی هەڵبژارد کە ئولولعەزمەکانن** ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَ مَا يُوعَدُونَ لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّن نَّهَارِۭۚ بَلَٰغٞۚ فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ۝٣٥﴾ الأحقاف: ٣٥ [3]. **ئەوانەش: نوح، ئیبراهیم، موسا، عیسا، موحەممەد ـ ن سەلامی خوا لەسەر هەموویانبێ، لەناو ئولولعەزمەکانیشدا**

---

(١) الحج : ٧٥. واتە: هەر خوا بە ویستی خۆی لە فریشتەکان و لە خەڵکیش فرستادە هەڵدەبژێرێت، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە (چاك دەزانێت کێ هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی پەیامەکەی).

(٢) الشعراء : ١٩٢- ١٩٦. واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانە کراوە. (١٩٢) جوبرەئیلی ئەمین (فریشتەی وەحی) دایبەزاندووە. (١٩٣) بۆ سەر دڵی تۆ ئەی محمد (ﷺ) تا بچیتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە خەڵکی بێدارەکەنەوە و لە خەوی غەفڵەت دایاندەچڵەکێنن. (١٩٤) بە زمانی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا، یاخود بە زمانێکی پاراو و شیرین و ڕوون. (١٩٥) بێگومان هەواڵی ڕاستی و دروستی ئەم قورئانە لە کتێبە پێشووەکاندا باسکراوە.

(٣) الأحقاف: ٣٥. واتە: کەوابوو ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دان بەخۆدا بگرەو خۆڕاگربە، هەروەکوو پێغەمبەرانی خاوەن ویستی بەهێز خۆڕاگر بوون، پەلەشیان لێ مەکە، ئەو ڕۆژەی کەبەڵێنیان دراوەتێ هەر کاتێک پێشهات وا دەزانن تەنها ساتەوەختێکیان لەڕۆژێکدا پێچووە، ئەمەبەڵێن و پەیام و ڕاگەیاندنێکی تەواوە، جا ئەو کاتەمەگەر تەنها تاوانباراو گوناهکاران نین کە تیادەچن؟!

**موحەممەدی هەڵبژارد بەسەر هەموو جیهاندا، ڕازیشی کرد و گەیاندیە پێگەیەک هیچ پێغەمبەر و فریشتەیەکی نزیکیش پێی نەگەیشت: ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝ فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ ۝ مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ ۝﴾ النجم: ٨ - ١١[١].**

**جا پێغەمبەری خوا چەندین دیداری لەگەڵ جوبرەئیل هەبووە هەر لە پێش پێغەمبەرێتییەوە وەک سنگلەتکردنەکەی کە منداڵ بوو لای بەنی سەعد، پاشان کە هەڵبژێردراو بوو بە پێغەمبەر لە ئەشکەوتەکەدا، دوای بە پێغەمبەربوونیشی کاتێک ژنێکی قوڕەیشی وتی وا دەزانم شەیتانەکەت فەرامۆشی کردوویت، ئەوکاتە جوبرەئیل بە وەحیەوە هات و ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝﴾ الضحى: ٣[٢] بەسەردا خوێند.**

**لە گەشتی ئیسرا و میعراجدا سەروەری فریشتەکان هاوەڵێتی سەروەری مرۆڤایەتی ـ دروودی خوای لەسەر ـ کرد تا ئاسمانەکان، پاشان جوبرەئیل جێما و موحەممەدی پێغەمبەر ڕۆشت بۆ لای ویستی خودایی و نزیکبووەوە.**

**بەم شێوەیە وەک لەمەودوا باسی دەکەین، پەیوەندی پێغەمبەر ـ درودی خوای لەسەر ـ بە جوبرەئیل و فریشتەی شاخەکانەوە پەیوەندی خۆشەویستی دوو لایەنە و ڕێزگرتنی ئاشکرا و داننانبووە بە گەورەیی و ڕێزی یەکتردا.**

**پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ لە زۆر شوێندا و زۆر بابەتی گرنگدا کە لێرەدا جێگای نابێتەوە ڕاوێژی پێدەکرد، ئەمەی وتمان تەنها زەمینەیەکی هاوبەشی گفتوگۆ بوو کە ئاشکراترە لەوەی ئاشکرا بکرێت و ڕونتریشە لەوەی ڕونبکرێتەوە.**

---

(١) النجم : ٨ـ ١١. واتە: لەوەودوا تا دەهات نزیک دەبۆوە و سەرەنجام هاتەخوارەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) (٨) ئەوەندە لێی نزیک بۆوە نێوانیان بەقەدەر دووکەوان یان کەمتریش بوو (٩) ئینجا خوا لەڕێگەی ئەوەوە، نیگای کرد بۆ بەندەی خۆی، ئای چ نیگایەک بووا (١٠) ئەوسا ئەوەی کە بە چاوی سەری بینی، لە ناخ و دەروونیەوە بڕوای پێی هەبوو، ناخ و دەروونی ڕاستیەکانی بەدرۆنەزانی.

(٢) الضحى: ٣. واتە: پەروەردگارت دەستبەرداری تۆ نەبووە و وازی لە تۆ نەهێناوە و خەشمی لێ نەگرتوویت.



## خواستی دووههم

# چەند نموونەیەک لە گفتوگۆکانی پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ لەگەڵ فریشتەکاندا

### پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ بێ تاقەتە:

عائیشە دەڵێت کە وتوویەتی بە پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا هیچ رۆژێکت بەسەرهاتووە هێندەی رۆژی ئوحود سەخت بووبێت لەسەرت؟ فەرمووی: بەدەست قەومەکەی تۆ زۆرم بەسەرهات، سەختترینیان رۆژی عەقەبە بوو، داوای پەنامکرد لە عەبدویالەیلی کوری عەبدوکیلال وەڵامی داواکەمی نەدایەوە، منیش بەبێ تاقەتی رۆشتم ئاگام لەخۆم نەبوو تا گەشتمە (قرن الثعالب) لەوێدا سەرم بەرزکردەوە پەڵەیەک هەورم دی سیبەری بۆ کردم، کە سەرنجمدا جوبرەئیلی تیادایە، بانگی کردم، وتی: پەروەردگار قسەی گەلەکەتی بیست، کە پێیان دەوتی، چۆنیش رەتیانکردەوە، ئەوەتا فریشتەی شاخەکانی بۆ لا ناردویت، هەر فەرمانێک دەتەوێت پێی بکە، فەرمووی: فریشتەی شاخەکان بانگی کردم و سەلامی لێکردم، پاشان فەرمووی: ئەی موحەممەد خودا قسەی قەومەکەتی بیست، کە پێیان دەوتی، منیش فریشتەی شاخەکانم، پەروەردگارت منی ناردووە بۆ لات تا فەرمانم پێ بکەیت جا چیت دەوێت؟ ئەگەر دەتەوێت ئەو دوو شاخەیان بەسەردا چەسپ دەکەم، بەڵام پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ پێی فەرموو: (بەڵکو ئومێدەوارم خودا لە پشتی ئەمانە کەسانێک بێنێتەدی کە خودا بە تاک و تەنها بپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێن).[1]

### گەلێکی نەخوێندەوار:

ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێت: پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوای لەسەر ـ گەیشتە جوبرەئیل و فەرمووی: جوبرەئیل من نێردراوم بۆ لای گەلێکی نەخوێندەوار، پیرەژن، پیرەپیاو، لاو،

---

(١) اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الجهاد والسير، باب ما لقى النبي من اذعاء برقم ٣٤٥٤.

کچۆڵە و پیاوانێکیان تێدایە کە هەرگیز شتیان نەخوێندووەتەوە، وتی: ئەی موحەممەد قورئان بە حەوت شێوە دابەزیوە.[1]

## چەکەکەت دانا!

عائیشە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - لە ڕۆژی خەندەقدا گەڕایەوە و چەکەکەی دانا و خۆی شت، جوبرەئیل هات بۆ لای کە سەری لەبەر تەپوتۆز داپۆشیبوو، وتی: چەکت دانا؟ بە خوا نابێت داینێیت، پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - فەرمووی: بۆ کوێ؟ وتی: بۆ ئەوێ، ئاماژەی بۆ بەنوقورەیزە کرد، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - بۆیان چوو.[2]

## مژدەی جوبرەئیل:

مەعروری کوڕی سوید دەڵێت: لە ئەبوزەڕم بیست لە پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - دەگێڕایەوە کە فەرموویەتی: جوبرەئیل هات بۆ لام مژدەی پێدام هەرکەسێک لە ئوممەتەکەت مردو هیچ هاوبەشی بۆ خودا دانەنابوو دەچێتە بەهەشتەوە، وتم: ئەگەر زینا و دزیشی کردبوو؟ وتی: ئەگەر زینا و دزیشی کردبوو.[3]

## حەفتا هەزار بەبێ لێپرسینەوە:

عەبدوڵلای کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا - درودی خوای لەسەر - دەفەرموێت: ئوممەتەکانم پیشان درا، پێغەمبەرم دەدی ئوممەتێکی لەگەڵ دەچوون، پێغەمبەریش کۆمەڵێکی لەگەڵ دەڕۆشت، پێغەمبەریش دە کەسی لەگەڵ دەچوو، پێغەمبەریش پێنج کەسی لەگەڵ دەچوو، پێغەمبەری وەهاش هەبوو بە تەنها دەڕۆشت، سەرنجمدا قەرەباڵغییەکی زۆرم دی، وتم: جوبرەئیل ئەمانە ئوممەتەکەی منن؟ وتی: نا، بەڵام سەیری

---

(١) اخرجه الترمذی في سننه في كتاب الذبائح، ابواب القراءات عن رسول الله برقم ٢٩٧٦، وقال: هذا حديث حسن صحيح.

(٢) أخرجه البخاری في كتاب الجهاد والسير، باب الغسل بعد الحرب والغبار، برقم ٢٦٨٠.

(٣) اخرجه مسلم في صحيحه في كتاب الايمان، باب من مات ولم يسر بالله دخل الجنه، برقم ١٦٥.

ئاسۆ بکە، سەیرم کرد قەرەباڵغییەکی زۆرم بینی، وتی: ئەوانە ئوممەتەکەی تۆن، ئەوانەش حەفتا هەزارن لە پێشیانەوە نە لێپرسینەوەیان لەسەرە نە سزا، وتم: بۆ؟ وتی: ئەوانە چارەسەریان وەرنەدەگرت، نوشتەیان نەدەکرد و باوەڕیان بە بەدقومی نەبوو، پشتیان بە خوای خۆیان دەبەست، جا عەکاشەی کوڕی مەحسن هەستا بۆ لای و وتی؛ لە خوا بپاڕێرەوە من بخاتە ناو ئەوانەوە، فەرمووی: خودا بتخاتە ناویانەوە، پاشان پیاوێکی تر هەستا بۆ لای و وتی: لە خوا بپاڕێرەوە منیش بخاتە ناو ئەوانە، فەرمووی: عەکاشە پێشتکەوت.[1]

## مرواریەکی درەخشانی مرواریيەکانی گفتوگۆ

## ئەی موحەممەد خۆت بۆ خوا خاکەراکە

ئەبوهورەیرە دەڵێت: جوبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ و سەیری ئاسمانی کرد، بینی فریشتەیەک دادەبەزێت، جوبرەئیل پێی وت: ئەمە فریشتەیەکە لەو کاتەوە دروستکراوە تا پێش ئەم ساتە دانەبەزیوە، جا کاتێک دابەزی، وتی: ئەی موحەممەد! پەروەردگارت منی ناردووەتە لات، ئایا پاشاییت دەوێت یان بەندە و پێغەمبەر بیت؟ جوبرەئیل وتی: ئەی موحەممەد خۆت بۆ خوا خاکەراکە، فەرمووی: بەندە و پێغەمبەریم دەوێت.[2]



---

(١) أخرجه البخاري في الجامع الصحيح، في كتاب الرقاق، باب يدخل الجنه سبعون الفا بغير حساب، رقم ٦١٩٨.

(٢) اخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب التأريخ، باب ذكر وصف مفاتيح خزائن الأرض برقم ٦٤٦٣ وقال الألباني في تعليقه على الترغيب والترهيب، ٣٢٨٠.



# خواستی سێهەم
# بە پوختی

فریشتە بەڕێزەکان پشتیوانانی پێغەمبەرانن، ڕەحمەتن بۆ جیهانیان و بە فەرمانی خودا هاوکاری چاکەکانن، هەر لە سەرەتای پەیامەوە هاوەڵێتی پێغەمبەریان کرد، هەر لەو کاتەوە کە جوبرەئیل لە ئەشکەوتەکەدا گوشی و باوەشی پێدا کرد، جوبرەئیل دوای ئەوەش لە شێوە مەزن و دروستبوونە بەسامەکەیدا خۆی نیشان داوە، جوبرەئیل ڕۆژێک هاوڕێیەتی فریشتەی شاخەکانی کرد بۆ لای، ئەو کاتەی پێغەمبەر تووشی ناڕەحەتی سەخت بوو، کە خەریک بوو لە قوڕەیشییەکان نائومێد ببێت و چوو بۆ تائیف، لە خەڵکی ئەوێش تووشی عینادی و خراپە هات، ڕووبەڕووی بوونەوە و دەریانکرد، جا پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - سکاڵای لاوازی خۆی و نەبوونی چارەی کرد، لای خودا کرد، فریشتەی شاخەکان مۆڵەتی خودایی هەبوو ئەگەر پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - بیەوێت کە دوو شاخەکەی دەوروبەری مەککە بەسەر دانیشتوانەکەیدا چەسپ بکات، بەڵام پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - بۆ ئایندەی ڕوانی و لە دەرسی پێغەمبەرایەتی تێگەیشت، هیوای خواست لە پشتی ئەوانەدا خەڵکێکی یەکخواپەرست هەڵکەون و خودا بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیارنەدەن.

پاشان جوبرەئیل لە ئیسرا و میعراجی شکۆداردا هاوەڵێتی پێغەمبەری کرد - درودی خوای لەسەر - ئاسمان لە دوای ئاسمان بەرزی کردەوە، لە هەموو ئاسمانێکدا پاسەوانە فریشتەکانیانی دەبینی و جوبرەئیل داوای دەرگاکردنەوەی بۆ دەکرد، پێغەمبەرانیش پێشوازییان لێ دەکرد، پاشان جارێکی تر جوبرەئیلی لەسەر شێوەی خۆی بینی لە سیدرەتولمونتەها، کە شەشسەد باڵی پێوە بوو، لە دوور و گەوهەر گەشاوەتر بوون.[1]

ئەوجا پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر - کەوتە جەنگەوە و جوبرەئیل و فریشتەکانیش لەگەڵی جەنگان، پێغەمبەری خوا پرسیاری لێ دەکرا وەڵامەکەی نەدەزانی، بەڵام دوایی

---

(١) اخرجه ابن حبان في صحيحه في كتاب التأريخ، برقم ٦٥٢٧.

وەڵامی دەدایەوە و دەیفەرموو: ئێستا جوبرەئیل پێی وتم، بۆیە فریشتە بەڕێزەکان و جوبرەئیلیش بەتایبەتی، هاوەڵێتی پێغەمبەریان لە زۆر شوێن دەکرد، پێغەمبەری خوداش ـ دروودی خوای لەسەر ـ سوودی لەو هاوەڵێتیە وەرگرت لە زۆر کاروباردا پرسی پێدەکرد، قورئانیشی دەخستە بەرچاوی، لە نێوان ئەو و ئەواندا هەندیک گفتوگۆ روویاندا ئاماژەمان بۆ بەشێکیان کرد، کە پوختەکەی ئەوەیە پێغەمبەری خوا ـ دروودی خوا لەسەر ـ چۆن هاوەڵێک لە هاورێیەکی راستگۆ و برایەکی دڵسۆز سوودوەردەگرێت، ئەویش بە هەمانشێوە سوودی لە جوبرەئیل وەردەگرت.



## وتار و کتێبە هاوچەرخەکان لەبارەی بابەتی ئەم توێژینەوەیەوە

لە کۆتاییدا ئەوی کتێبخانەی ئیسلامی بپشکنێت لەم بارەوە، دەبینێت زۆر هەژارە و کەم و کورتی زۆری تێدایە، مەبەستم لەسەر گفتوگۆ لە ژیاننامەی پێغەمبەردا ـ درووودی خوای لەسەر ـ .

من کە لە ژیانی پێغەمبەر ورد بومەوە سەرسوڕما لەو گشت و گفتوگۆیەی تیایدا، کە گفتوگۆ بوەتە بنەمایەک لە بنەماکانی هیدایەت، لە زۆر گۆشەکانی ژیاننامەوە لەگەڵ گەیو و خەڵکە جیاوازەکاندا.

دەبینین پێغەمبەری رەحمەت ـ دروودی خوای لەسەر ـ پشتی بە گفتوگۆ دەبەست وەک جوانترین شێوازی فێرکاری و نزیکترین رێگای کاریگەر لەسەر ئەوانیتر، کە مرۆڤ ناچاری بیرکردنەوە و عەقڵکاری دەکات و دەرفەتیشی دەداتێ تا هاو بەشیبکات لە دروستکردنی خاڵی بە یەکگەیشتندا، هەر بە گفتوگۆ دەست دەخرێتە سەر شوێنە جیاوازەکان تا ئەوی کۆن بوە نوێ بکرێتەوە و ئەوی روخاوە بنیات بنرێتەوە، بۆ ئەوەی برایەتی مرۆیی بگاتە دیدێکی چەسپاو کە دژایەتی بگۆڕێت بە دۆستایەتی، کینە بە خۆشەویستی.

ئەگەر ئەمانە نەکرێن، بەلای کەمەوە دەبێت تێگەیشتن روو بدات، لێکترازان و پشت لە یەککردن و شەڕ و ئاژاوە کاڵ بێتەوە، لەبری ئەوە شەبەقی موناقەشە و بەڵگە کاری و گفتوگۆ و سەرنجەکان هەڵبێت، با هەر گەلێک ئەوی پێیەتی دەریخات و هەر تاقمیک ئەوەی خۆی قەناعەتی وایە کە راستیە و لایەتی نیشانی بدات، خۆزگە گەلانی دنیا ئەم رێبازە بکەن بە رێگایەکی جیگیر و رێبازێکی بنەڕەتیی، بێگومان مرۆڤایەتی دەگاتە بەختەوەریەک کە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە بەخۆیەوە نەیدیوە ئەویش پێشەوای گفتوگۆکاران و وتوێژکاران بوو.

## یا أهل الکتاب تعالوا الى كلمه سواء:

**گفتوگۆی موسڵمانان لەگەڵ خاوەن ئایینەکانی دیکەدا بەردەوامە و هەمیشەییە، چونکە لە قورئانی پیرۆزدا نووسراوەتەوە:** ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾﴾ المائدة: ٦٨ [1]، **دەشفەرموێت:** ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾﴾ الأنعام: ٩١ .[2]

**کەواتە وەرن با گفتوگۆ و وتووێژی جوان بکەین، روونی بکەینەوە کە لای ئێمە موسڵمان کەسێک پێی ناوترێت موسڵمان ئەگەر لە موسایان عیسا بەکەم بزانێت، چ جای باوەڕی پێیان نەبێت، بەڵام سەرنج بدەن بزانن کاڵفامەکانی ئێوە چۆن سوکایەتی بە پێغەمبەری ئێمە دەکەن و کردویانەتە گاڵتەجاڕ و وێنەی گەش و درەوشاوەی دەشێوێنن، کەچی ئەم دەمدرێژی و خراپەکارییە بە بەڵگەی بێ بنەما پاساو دەدرێت و دەپارێزرێت.**

(١) المائدة : ٦٨. واتە: (ئەی محمد (ﷺ) بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب، ئێوە لەسەر هیچ بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامێک نین، هەتا بەچاکی پەیڕەو و پیادەی تەورات و ئینجیل و ئەوەی (لەم دواییەدا، کە قورئانە) نەکەن کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزیووە، سوێند بێت بەخوا زۆربەیان ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە یاخی بوون و ستەمیان زیاد دەکات و نغرۆیان دەکات لە بێ باوەڕیدا (کەچی لەجیاتی گوێڕایەڵی و ملکەچیی زۆربەیان هەوڵ دەدەن شت هەڵبەستن بۆ ئەو قورئانەی کە بۆمان ڕەوانە کردوویت)، جا ئیتر خەفەت و پەژارە دات نەگرێت بۆ ئەو گەلە بێ باوەڕە، (کاتێک: باوەڕ ناهێنن، کاتێک تۆڵەیان لێ دەکەینەوە لە دنیادا پێش قیامەت).

(٢) الأنعام : ٩١. واتە: (جولەکە) وەکو پێویست قەدری خوایان نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، چونکە وتیان: خوا هیچ کتێبێکی بۆ هیچ کەس دانەبەزاندوە، پێیان بڵێ: باشە ئەی کێ ئەو کتێبەی دابەزاند کە موسا هێنای (بۆتان)، لەکاتێکدا نوورو هیدایەتیش بوو بۆ خەڵکی، کەچی ئێوە بەش بەش و پارچە پارچەی دەکەن و ئەوەی بەدڵتان بێت نیشانی خەڵکی دەدەن و زۆریشی دەشارنەوە (بەتایبەت دەربارەی پێغەمبەر و قورئان) هەروەها بڵێ هەندێک شت فێرکران کە نە ئێوە نە باو و باپیرانتان دەتانزانی، پێیان بڵێ: هەر خوا خۆی دایبەزاندوە و فێریشی کردوون، لەوەودوا وازیان لێ بهێنە با لە بەتاڵ و نادروستی خۆیاندا ڕۆبچن و گەمەو یاری بکەن!!

سەرنج بدەن و بپشکنن و بگەڕێن چەندەی دەتوانن بە هەموو تەکنیک و هۆکارەکانی گەیاندن و ئامێرەکانی توێژینەوەوە، ئایا پاش ئەو گشت دژایەتیە ستەمکارانەی کە کاڵفامەکانی ئێوە بەرامبەر پێغەمبەر کردیان ئایا موسڵمانێک دەدۆزنەوە زیادەڕەویەک لەسەر عیسای مەسیح بکات؟ یان لە قەدری کەم بکاتەوە؟ یان ئاماژە بۆ شێوەی دروستبوونی بدات؟ نەخێر هەرگیز ئەمە رووینەداوە، دەزانن بۆ؟ چونکە ئێمە نەوەکانمان لەسەر رێزگرتنی پێغەمبەران پەروەردەکردون، کە خۆشیان بوێن و بیانخەنە ئەو پێگەیەوە کە ئەوان شایستەیبن، چونکە ئەوانە مرۆڤگەلێکن خودا بژاردەی کردون و چاکەیان بەسەر هەموو خەڵکەوە هەیە.

قورئانەکەی ئێمە کە هەندێک لە کاڵفامەکانی ئێوە دەیانخستە ژێر پێ و پێڵاویان پێ دەسڕی و فڕێیان دەدایە شوێنی ناشایستەوە، ئەو قورئان بەرزە نهێنی ئەوەیە کە موسڵمانان رێز لە پێغەمبەران بگرن بە پابەند و ناپابەندەکانەوە.

کەواتە چەندە جیاوازییەکی فراوان هەیە لە نێوان نەوەکانی ئێمە و ئەوانەی ئێوە، ناپاندەکانی ئێمە و کاڵفامەکانی ئێوە، بە متمانەبوونم بە دینەکەم، منیش قسەی پێغەمبەری خوا دەکەم، کە بە پێشبینەکانی ئێوەی وت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمران: ٦٤ [(١)].

خۆزگەگەر بەمەش رازینابن تەنها دەسەڵاتی ئەم پاڕانەوەم هەیە کە پێغەمبەر ـ دروودی خوای لەسەر ـ کردی: خودای جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، شارەزایی پەنهان و ئاشکرا، تەنها تۆ حوکم دەدەیت لە نێوان جیاوازی بەندەکاندا،

---

(١) آل عمران : ٦٤. واتە: (ئەی محمد (ﷺ) بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانەکراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمەش و ئێوەشدا (ئەویش ئەمەیە): جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین، هیچ لایەکمان لاکەی ترمان (بەپیرۆز و فەرمانڕەوا دانەنێین) لەجیاتی ئەو زاتە و نەیپەرستین (خۆ ئەگەر لەم بانگەوازدا) سەرپێچیان کردو گوێیان پێنەدا، ئەوە پێیان بڵێ: کە ئێوە بەشایەت بن کە ئێمە موسڵمانین و ملکەچی فەرمانی پەروەردگارین.

خودایە هیدایەتم بدە لەو شتانەدا خەڵکی لەسەریان جیاوازن، تۆ هەر کەست بوێت هیدایەتی ڕێگای ڕاستی دەدەیت.



## ئەو وتارو كتێبە هاوچەرخانەی كە بە زمانی عەرەبی لەسەر ئەم بابەتە نووسراون:

١) قراءة في كتاب "القرآن والتوراة والإنجيل والعلم" لموريس بوكاى للكاتب نور الإسلام، الأزهر وأصله مقال بمجلة رسالة المسجد العدد الخامس شوال ١٤٢٤هـ/ديسمبر ٢٠٠٣م.

٢) الحوار آدابه وضوابطه في ضوء الكتاب والسنة، يحيى بن محمد زمزمي، الطبعة الأولى ١٤١٤هـ - ١٩٩٤م، دار التربية والتراث.

٣) حوار الرسول ﷺ مع اليهود، محسن عبدالناظر، دار الدعوة، الكويت، ط١، (١٤٠٩هـ)، (١٧٠)ص.

٤) أسلوب الحوار النبوي بين إقناع العقل وإثارة الوجدان، هاشم عبدالرحمن، الناشر: خاص، مصر، ط١، (١٤٢٠هـ) (٩٥)ص.

٥- الحوار في السنة وأثره في تكوين المجتمع، تيسير محجوب الفتياني، مركز الكتاب الاكاديمي، عمّان - الأردن، ط١، (١٤٢٠هـ)، (٢٤٩)ص.

٦) في أصول الحوار، إعداد وحدة البحوث بالندوة العالمية للشباب الإسلامي، الطبعة الثالثة ١٤٠٨ هـ - ١٩٨٨م، مؤسسة الطباعة الصحافة والنشر جدة.

٧) الحوار مع أصحاب الأديان مشروعيته وشروطه وآدابه، أحمد بن سيف الدين التركستاني.

# بابەت — پێڕست — لاپەڕە

بەم سـەردەمە دەوترێت چەرخـی گفتوگۆکـان، گفتوگـۆی شارسـتانیەتەکان، ئاینەکـان، گەلان، مرۆڤەکـان،... بـێ ئاگـا لەوەی مـوحەمەدی پێغەمـبەر و سـەرکردە ـ دروودی خـوای لەسـەر ـ زۆر لەمێـژە ئەو دەستپێشـخەرییەی کـردووە و لە ڕێگـای گفتوگـۆوە سـەرنجی زۆر کەس و گەل و خـاوەن ئـاینی دیـکەی ڕاکێشـاوە و دانیـان بە مەزنـی و سـەروەری خـۆی و راسـتێتی ئاینەکەیـدا نـاوە. نووسـەری ئەم کتێبە بە بەڵـگەی ڕاسـت و دروسـت ئەم حەقیقەتـانەی سـەلماندووە، کە بەڕاسـتی شـێوازێکی نـوێی خسـتنەڕووی ژیـان و ئاکـاری پێغەمـبەری مەزنە، دوورکەوتنەوەیە لەو داڕشتنە باوەی کە مێژوونووسان لەسەری ڕاهاتوون.

07501269689
07701932749
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوێرپاک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆماڵ - دوکانی ژمارە (٦٩)



٦٠٠٠ هەزار دینار